کۆمەڵە چیرۆک

# قسە نەووتراوەکانی دڵم

## زەیتوون یاسین

# قسە
# نەووتراوەکانی
# دڵم

زەیتوون یاسین

# ناسنامەی کتێب

- ناوی کتێب: قسە نەووتراوەکانی دڵم
- نووسەر: زەیتوون یاسین
- بابەت: کۆمەڵە چیرۆک
- پێداچوونەوە: هیوا پشتیوان
- دیزاینی بەرگ و ناوەڕۆک: هیوا پشتیوان
- چاپ: یەکەم ٢٠٢١

- هەرگیز کۆڵ مەدە! گەر کۆڵ نەدەی دەگەی بە لوتکە.
- هەمیشە سەیری ئەو کەسانە بکە، کە ئێستا سەرکەوتوون. لەبەر ئەوەی هەمیشە دوای هەر کەوتنێک دووبارە هەڵساونەتەوە و کۆڵیان نەداوە.
- هەمیشە سەیری ئاوێنەیەک بکە، کە خودی خۆتی تێدا بیت نەک کەسێکی تر.

***زەیتوون یاسین***

## پێشەکی

بە ناوی خودای گەورە و میهرەبان. سەرەتا زۆر سوپاس بۆ خودای گەورە کە توانای ئەوەی بە من بەخشی، بتوانم ئەو خەونەی زۆر دەمێکە دەمویست بەدیبهێنم لە دوای ئارام گرتنێکی زۆر و بە تێڕوانینێکی زۆر؛ لە دیدی نوسین و خوێندنەوە. منیش توانیم کتێبێک بنوسم کە ڕەنگدانەوەی خودی کۆمەڵگە بێت و لە هزری هەر تاکێکەوە گوزارشت بکەم لەو ڕووداوانەی کە هەیە و کە ڕەگ و ڕیشەیان داکوتاوە. لە ناو ناخی ئەو کۆمەڵگەیە. لەم کتێبەدا دەستم کردووە بە نووسینی ئەو ڕووداوانەی کە بوونیان هەیە لە کۆمەڵگادا. بەڵام لە هزری خۆمەوە چیرۆکەکانم داڕشتووە بۆ ئەوەی لە ڕێگەی ئەو چیرۆکانەوە بتوانین ورد بینەوە لەو ڕووداوانەی کە بەسەر هەر تاکێک لەو کۆمەڵگەیەدا هاتووە. ئەوەی لێرەدا گرنگە بۆ خوێنەر باسی بکەم ئەوەیە زۆر نوسەر هەیە دەستیان کردووە بە نوسینی کتێب و دەیەوێت ئەوەی لە هزری خۆی هەیەتی لە ڕێگەی چیرۆک، ڕۆمان یان هەر بابەتێکی دیکەدا باسی بکات و بە هزری خەڵکی بگەیەنێت. زۆر زۆر چیرۆک هەیە؛ چیرۆکمان هەیە ڕاستییە کە نووسەر هەڵدەستێت بە کۆکردنەوەی ئەو ڕووداو و چیرۆکانەی کە لە زمانی تاکێکەوە باسی دەکرێت. نوسەریش دێت ئەو چیرۆکە ڕاستییە لە زاری ئەو تاکانەوە -کە بەسەریان هاتووە-

دەینووسێتەوە و دەیکات بە کتێبێک کە هەمووومان دەیبینین و ڕووداوەکان بۆمان دەبێتە پەند و ئامۆژگاری. وە جۆرێکی تریش لە نووسینی چیرۆک هەیە، کە ئەویش چیرۆکی خەیاڵییە کە لێرەدا نووسەر هەڵدەستێت بە نووسینی چیرۆک لە هزری خۆیەوە کە باسی کۆمەڵێک ڕووداوی نێو کۆمەڵگە دەکات لە دارشتنی کارەکتەرەکان و ڕووداوەکان لە هزری خۆیەوە. ئەمەش ناو دەنرێت بە چیرۆکی خەیاڵی. لەم کتێبەی منیش "قسە نەووتراوەکانی دڵم" هەموو ئەو چیرۆکانەی نوسیوومە چیرۆکی خەیاڵین لە هزری خۆمەوە دامرشتووە بەڵام ئەو ڕووداوانەی باسم کردوون هەمووی ڕاستی تاڵی کۆمەڵگەی ئێمەیە و بوونی هەیە! بۆیە منیش بیرم کردەوە؛ چۆن بتوانم ئەو ڕووداوانەی بەسەر هەر تاکێک دا دێت بخەمە ڕوو و ببێتە پەند و ئامۆژگاری و بەرچاو ڕوونی بۆ هەر یەکێک لە ئێمە. بۆیە دوای هەوڵدانێکی زۆر و یارمەتییەکی زۆری کەسە نزیکەکانم، توانیم دەست بە نووسینی ئەم کتێبە بکەم لە ژێر ناونیشانی "قسە نەووتراوەکانی دڵم" کە بتوانم سوودێکی بچووکیش بێت، بە خوێنەری بگەیەنم و لەم کتێبەی من پەند و ئامۆژگاریەکی بچکۆڵەش بێت وەریبگرن. وە دووبارە سوپاس بۆ خودا و هەموو ئەو کەسانەی کە هاوکارم بوون لە تەواو کردنی ئەم کتێبەدا.

***زەیتوون یاسین***

## مونام و دۆزینەوەی وەڵام بۆ پرسیارەکانی

لە شارێکی گەورە! لە ماڵێکی گەورە ژوورێکی بچووک هەبوو. کە لە ناو ماڵەکە شوێنێکی بچووکی داگیرکردبوو لەم ژوورەش کچێک هەبوو کە ژیانی پربوو لە ڕووداوی سەیر و سەمەرە، کە هەمیشە وێڵ بوو بە دوای وەڵامێک بۆ پرسیارەکانی کە هەمیشە عەودالی دۆزینەوەی خودی ناخی خۆی بوو. ئاخۆ ئەو کچە دەتوانێ وەڵامە ونبووەکان بدۆزێتەوە؟ با لە ڕووداوەکانەوە سەیربکەین...

من (مونام) تەمەنم بیست ساڵە. لە زانکۆ دەخوێنم لە خێزانێکی دوو کەسی دەژیم لەگەڵ باوکم و خزمەتکارێ. لەو کاتەی چاوم بە دونیا هەڵهێناوە لە ژیانم تەنیا ئەو دوو کەسە بوونی هەبوو

باوکم بۆ بەخێوکردنی من، وە خزمەتکارێک بۆ بەڕێوبردنی کاروباری ناو ماڵ. لەوانەیە بڵێن ئەی دایک؟ ئەی سۆزی دایک؟ من دایکم نییە. یان دەتوانم بڵێم نازانم ئاخۆ دایکم ماوە یان مردووە! ئەوە هەمیشە پرسیارە بێ وەڵامەکەی من بووە ئاخۆ بۆ من دایکم نییە؟ بۆ وەکوو منداڵەکانی تر دایکم نییە؟ کەسێک نییە لە ئامێزم بگرێ گۆرانیم بۆ بڵێ. بەڵام هەمیشە ئەو پرسیارە بێ وەڵامە هەر کاتێک دەمەوێت سەبارەت بە دایکم لە باوکم بپرسم دەڵێت: «مونام کەی کاتی خۆیَ هات پێت دەڵێم.» ئاخۆ کەی کاتی خۆیَ بێت و بتوانم تێبگەم لەم پرسیارە؟ ئەو ڕۆژە کەش و هەوایەکی زۆر خۆش بوو. لە پەنجەری ژوورەکەم هەستم بە نەسمەی هەوا و دەنگە دەنگی باڵندە کرد و دەنگە دەنگی قاپی مەتبەخەکە منی بە ئاسپایی بە ئاگا هێنا! ڕایکێشام بۆ دەرەوە. لەوکاتە خزمەتکارەکە لە دەرگایدا و وتی: «خاتوو مونام هەستە خواردن ئامادەیە باوکت چاوەڕێت دەکات.» منیش بەپەلە لەسەر جێگاکەم هەستام خۆم ئامادەکرد. بە خێرایی چوومە خوارەوە چوومە سەر مێزی نان خواردن وتم:

- باوکە بەیانیت باش
- بەیانی تۆش باش مونام کچم، نانەکەت بخۆ ئەمڕۆ دەتبەم بۆ شوێنێک.
- بۆ کویَ؟
- بۆ کۆمپانیا.

- کۆمپانیا!؟
- بەڵێ...

با لە بیریشم نەچێت. باوکم خاوەن کۆمپانیاییە و بازرگانە. با چیرۆکەکە تەواو بکەین. ئینجا منیش لە وەڵامدا وتم: «باشە بەچاوان بۆ نا. منیش حەز دەکەم کەمێک لە ماڵ بێمە دەرەوە. بە ڕاستی ماڵەوە منی خنکاندووە!» ئەوە بووە دوای نانی بەیانی بەڕێ کەوتین بۆ کۆمپانیاکەی باوکم گەشتینە کۆمپانیا. هەر کە گەشتین لە لای دەرگا کە سڵاوێکی گەرمم لێکرا و دەیانووت: «خاتوو مونام بەخێربێیت. بەڕاستی کۆمپانیات ڕووناک کردەوە» بەڕاستی پێشتان بڵێم من جۆرێک لە خۆپەرستیم بۆ درووست بوو. وا دەڕۆیشتم لە کۆمپانیا وەک بڵێی کەس نەبێت لە مونام زیاتر چونکە من کچی پیاوێکی بازرگان بووم هەر چیم بوتبا یان کردبا هەر ئەوە بوو. دوای بە خێرهاتن و سڵاو دانیشتم لەسەر کورسییەکەم کۆمەڵێک کاغەز و قەڵەم لە پێشم و وەکوو بڵێ من خاوەن کۆمپانیام. باوکم وتی:

- مونام لە ئێستاوە ئێرە شوێنی تۆیە تۆ دەبێت بە هاوکاری من تۆ جێگەی من دەگریتەوە کۆمپانیا بەڕێوە دەبەیت من ناتوانم تا سەر ئەم کۆمپانیایە بەڕێوە ببەم بەڵام تۆ کچی منی دەبێت تۆ جێگەی من بگریتەوە.

ئەوەبوو دەستی باوکمم تووند گوشی و لە ئامێزم گرت وتم:

- وا مەڵێ باوکە پشت بە خودا تەمەنت درێژ دەبێت .جا من ماڵ و موڵکم بۆ چییە دوای تۆ من بەس تۆم هەبێت بەسم.
- نا مونام تۆ دەبێت بەهێز بیت دەبێت دوای من لەسەر ئەم کورسیە دانیشی. ئەوە بوو چوومە سەر کورسییەکە دەستم بە کار کرد. بەم شێوەیە ژیانم تێپەڕ بوو زۆر پەیوەست بووم بە کۆمپانیا هەمیشە چست و چالاک بووم بەڕاستی ئاسوودە بووم وە زۆر دڵخۆش دەبووم کاتێک لە ئیشەکەم سەرکەوتوو دەبووم وە زیاتر لەوە دڵ خۆشتر دەبووم کە دەمبینی باوکم لە تەنیشتمە. ئەوە بەهێزتری دەکردم.

بەم شێوەیە ژیان بەردەوام بوو. هەر لەگەڵ پرسیارە بێوەڵامەکان و نەبووی دایکم. تا ڕۆژێک شتێک لەژیانم ڕوویدا کە تا ئێستا بیرم لێ نەکردبوویەوە هەر بیرم بۆی نەدەچوو. ئەویش ئەوەبوو کاتێک لە کۆمپانیا بووم وەکوو ڕۆژەکانی تر خەریکی کارکردن بووم لە ناکاو لە دەرگا درا منیش وتم:

- فەرموو.
- سڵاو من پۆستەچیم .نامەیەکت لە کەسێکەوە بۆ هاتووە.
- منیش وتم نامە؟ بۆ من؟

من لە ژیانم تا ئێستا کەسێک نامەی بۆ نەناردووم بە ڕاستی سەرم سوڕما و وتم:

- کێ بۆی ناردووم؟

- نازانم خاتوون تەنیا داواکاری جێبەجێ دەکەم. ئێرە ئیمزابکە.

منیش ئیمزام کرد و وتم:

- سوپاس.

دانیشتم لەسەر کورسیەکەم دەستم بە کردنەوەی نامەکە کرد کە نامەکەم کردەوە ئای خوایە! چیم بینی بە بینینی ئەم نامەیە دەستەکانم سڕ بوون وەک بڵێی ڕوح لە جەستەم نەمابێ ئەزانن بۆ؟ چونکە لە نامەکە بەم شێوەیە نووسرا بوو:

*سڵاو کچەکەم...*

*من دەزانم ئێستا تۆ باوەڕ ناکەی بەم نامەیە و وا دەزانی ئەمە درۆیە. بەڵام پێویست بوو بۆت بنێرم. من دایکی تۆم ئەزیزم من پێویستە بتبینم تا پێت بڵێم چی ڕوویداوە.*

هەر پیتێک هەر وشەیەک کە دەمبینی نەمدەزانی ئاخۆ ئەمە درۆیە یان ڕاستییە ئەوە چی دەڵێ؟ من دایکی تۆم؟ یانی چی ئاخر؟ دوای ئەو هەموو ساڵە کە لە نەبوونی دایک لە سۆزی دایک ئێستا کەسێک دەڵێ من دایکی تۆم نانا مونام وەرەوە هۆش خۆت ئەم نامەیە درۆیە دووعام دەکرد کەسێک بێت لەم خەونە بە ئاگام بهێنێتەوە دوای خۆ کۆکردنەوە وتم: «تەواو مونام تەواو ئەمە درۆیە» بۆیە نامەکەم دڕاند بێ هیچ وەڵامێک فڕێم دایە تەنەکە خۆڵەکە. بێ یەک و دوو دانیشتم دووبارە دەستم بە

کارکردن کردەوە بێ بیرکردنەوە لەو نامەیە.  ڕۆژگار ڕۆشت هەر لە تێپەڕبوونی تەمەنی من هەر وەڵامی پرسیارەکانم نەبوو! بەڕاستی ناخۆشە بە دوای وەڵامێک بگەڕێیت کەچی تەواوی ژیانت هەر بە دوای وەڵامەکەی بیت و نەیدۆزیتەوە. منیش وابووم. ڕۆژێکیان لە ژوورەکەم خەریکی کتێب خوێندنەوە بووم لە دەرگا درا خزمەتکارەکە بوو و وتی:

- خاتوو مونام ئەم نامەیە بۆ تۆ هاتووە .

منیش سەیرێکم کرد و وتم:

- سوپاس دەست خۆش

دوا ئەوەی منی جێهێشت لە ژوورەکەمدا دەرگای داخست لە دوای خۆی منیش دانیشتم کتێبەکەم داخست. دەستم بە کردنەوەی نامەکە کرد نامەکەم کردەوە چیم بینی دیسان هەمان شت ئای هاوار خودایە دووبارە هەمان نامە پێشوتر کە بۆم هاتبوو دیسان نوسرابوو:

*سڵاو کچم...*

*من دەمەوێت تۆ ببینم. دەزانم نامەی پێشترت دڕاندووە و گوێت پێنەداوە بەڵام باوەڕ بکە من دایکی تۆم. تکایە وەرە بۆ ئەم ناونیشانە...*

منیش دووباره کەوتمە بارودۆخێکی ناهەموارەوە. لە بێدەنگی خۆم نقوم بووم. لە ناکاو وتم: «نا مونام دەبێت بزانی مەسەلە چیە و ئەوە کێیە دوای ئەو هەموو ساڵە دەڵێ من دایکی تۆم بێ هۆ نییە!» مونام تۆ چەند ساڵ بە دوای ئەم وەلامەی. تۆ چەند ساڵە وێڵی بە دوای چارەنووسی خۆت! بڕۆ جا وابێت یان نا بۆیە کەوتمە شەڕ لەگەڵ دەروونی خۆم! دوای ماوەیەکی زۆر لە گفتوگۆ لەگەڵ خۆمدا بڕیارمدا بچم. بۆیە زۆر بەپەلە خۆم کۆکردەوە و زۆر بە خێرایی چووم بۆ ئەو ناونیشانەی کە لە نامەکە نوسرابوو زۆر بە پەرۆش بووم. گەیشتمە شوێنی مەبەست کە گەیشتم کەسی لێ نەبوو زۆر هیلاک بووم. چووم لەسەر کورسییەک دانیشتم چونکە بەڕاستی لێدانی دڵم زۆر خێرابوو. قاچم توانای نەبوو بۆیە لەشم سست بوو دانیشتم چاوەڕێم کرد لەم کەین و بەینەدا کەسێک وتی:

- سڵاو ئەزیزم...

کە سەیرم کرد ژنێکی زۆر جوان  کە بەڕاستی جوان بوو وتی:

- زانیم کە هەر دێیت چونکە تۆ کچی منی ئەزیزم.

ویستی لە باوەشم گرێت بەڵام من دوورم خستەوە لە خۆم  و وتم:

- ئەوە چی دەڵێی کچی چی دایکی چی تۆ باسی چی دەکەی یانی هێندە ئاسانە هاتووی دەڵێی من دایکی تۆم لە ئامێزم

دەگریت نا ئەمە گاڵتەجاریە ئەگەر بە ڕاستی دایکی من بووبایت، لە ژیانم دەبووی گەورەت دەکردم... نەک دوای ئەو هەموو ساڵە! من باوەڕ ناکەم ئەگەر دایکم بووبایت جێت نەدەهێشتم. نا من دەڕۆم تۆ دایکی من نیت.
بۆیە ویستم بڕۆم یەکسەر قۆڵی گرتم وتی:

- ڕاوەستە دەتەوێت ڕاستیەکە بزانی باشە پەیوەندی بە باوکتەوە بکە با باوکت بێتە ئێرە. ئینجا ئەو کاتە تۆ ئارەزووی خۆتە دەڕۆی یان نارۆی.

منیش ڕاوەستام دوای بێدەنگیەکی زۆر پەیوەندیم بە باوکمەوە کرد و وتم:

- باوکە سلاو دەمەوێت بێیت بۆ شوێنێک. توشی کێشە بوومە.
- چیت لێهاتووە کچم مونام خۆ هیچت لێنەهاتووە .
- نا باوکە من باشم تەنیا تۆ وەرە.

تەلەفۆنەکەم داخست و پێیم وت:

- وا باوکم دێت ئینجا دەزانم ئاخۆ تۆ ڕاستی یان من.

هەر کە باوکم گەیشت سەیری باوکم کرد لە چاوانی باوکم کۆمەڵێک ڕووداو و وەلامم دەدۆزیەوە. قاچەکانی باوکم لە ڕۆشتندا وەکوو پێشتر نەبوو. هەر وەکوو بڵێی باوکم قاچی نەبێت زۆر بە هێواشی هات بۆ لامان. سەیرێکی کردم و وتی:

- مونام چی بووە بۆ منت هێناوەتە ئێرە؟ ئەوە کێیە ؟

- منم چیە نامناسی من هاوسەرەکەی تۆم ئەو ژنەی کە پێت دەوت لە تۆ زیاتر کەسی ترم خۆش ناوێت ئەو ژنەی کە ئێوەی جهێشت لە پێناو کەسێکی تر بۆ ناڵێی بۆ ڕاستیەکە باس ناکەی بۆ مونام بۆ پێی ناڵێی چ جۆرە دایکێکی هەبووە کە دایکێک منداڵێکی ساوا بە جێی بهێڵێت کە هێشتا لە ژیان تێنەگەیشتووە بۆ باسی ناکەی؟

باوکم چاوەکانی پڕ بوو لە فرمێسک هەر سەیری منی دەکرد منیش لە ناو ئەو هەموو ڕووداوە تاسا بووم نەمدەزانی من کێم من دایکم کێیە وەکوو جەستەیەکی بێ ڕوح بووم تەنیا سەیرم دەکردن. تەواو لە ناکاو باوکم هاواری کرد وتی:

- باشە... ڕاستە تۆ دایکی مونامی هاوسەری من بووی بەڵام دوای چی تازە هاتووی دەڵێی من دایکی مونام بە چ مافێک پێم بڵێ؟

باوکم ڕووی کردە من وتی:

- مونام ئەو دایکی تۆیە ئەو ژنە بوو تۆی جێ هێشت ئێستا زانیت کە تۆ هیشتا منداڵ بووی بە جێیهێشتی ئەوە ئەو ژنەیە کە چەند ساڵە بە دوای وەڵامەکەی دەگەڕێی.

منیش هەر لە بێدەنگی خۆم بووم وتم:

- نا ئەمە درۆیە ئەمە خەونە، تکایە با کەسێک بێت لەم خەونە بەئاگام بهێنێتەوە...

دایکم  دەستی گرتم وتی:

- کچم بمبووره تکایه من هەڵه بووم !

منیش توند دەستم بەردا و وتم:

- لاچۆ تۆ چۆن بە خۆت دەڵێی دایک؟ تۆ دەزانی دایک واتە چی دایک شەڕ لە پێناو منداڵەکەی دەکات دایک واتە ئارامی لە باوەشی نەک منداڵەکەی جێ بهێڵێ.

بۆیە زۆر بە خێرایی ڕۆشتم لەناکاو گوێم لە دەنگێک بوو کە سەیری دواوەی خۆم کرد ئای هاوار مونام ئەوە چی بووە چیم بینی! دایکم سەیارە لێی دا لە ناو خوێن نقوم ببوو باوکم زۆر بەخێرای ڕۆیشت هەڵیگرتەوە و وتی:

- مونام وەرە بۆ لەوێ ڕاوەستاوی؟

ئاخر چی من نەمدەزانی چیبکەم ئەو هەموو ڕووداوە یەک لە دوای یەک ڕوویدا نەم دەزانی چی بکەم. بەڵام ئەوەندەم زانی باوکم قۆڵی ڕاوەشاندم وتی:

- بۆ ڕاوەستاوی وەرە...

منیش هاتمەوە هۆش خۆم بەپەلە چووین بۆ نەخۆشخانە لەوێ چاوەڕێی مەرگ و ژیانی کەسێک کە بڕیارە دایکت بێت. من و باوکم بە چاوەڕوانی وێڵ بووین تا لە ناکاو دکتۆرێک هات وتی:

- ئێوە کەس و کاری ئەون بەداخەوە نەخۆشەکە مرد!

ئای لەم هەواڵە من و باوکم سەیری یەکترمان کرد بە سەرسوڕمانەوە دانیشتین هیچمان توانای قسەکردمان نەبوو من دووبارە کەوتمە گفتوگۆ لەگەڵ نەفسی خۆم دەموت:

- مونام ئەوە چیە چی ڕوویداوە دووبارە کەسێک کە چەند ساڵە  لە دوای وەڵامەکەی دەگەڕێیت دۆزیتەوە بەڵام لە دەستدا مونام ژیانت بۆ وایە  بۆ هەمیشە دەبێت بە دوای وەڵامەکان بگەڕێیت ئای خودایە تکایە با ئەمە خەون بێت.

باوکم توند دەستمی گوشی وتی:

- مونام دەبێت بە کەس و کاری بڵێین با بزانن.
- باشە باوکە.

بۆیە باوکم دوومەتر دوورکەوتەوە دەستی بە قسەکردن کرد ئەوەبوو دوای چەند کاتژمێرێک سێ منداڵ زۆر بە خێرایی بۆلای ئێمە هاتن وتیان:

- تکایە دایکمان چی لێهاتووە خۆ نەمردووە.

باوکم وتی: ئارام بن تکایە...

ئەوانیش هەر دەگریان یەکێک لە منداڵەکان ڕایکرد بەرەوە من و وتی:

- دادە تکایە دایکم چی لێهاتووە ئێمە لە دایکمان زیاتر کەسمان نییە.

منیش لە سەرچۆک بۆی دانیشتم چونکە بچووک بوو منداڵێکی زۆرجوانی بێ گوناە وتم:

- ئەزیزم دایکت باشە ئەو چووە بۆ شوێنێکی زۆر خۆش ئێستا ئەو دڵخۆشە لەو شوێنە.

ئەویش چاوەکانی پڕبوون لەفرمێسک. منیش توانام نەما بۆیە زۆر بەکوڵ گریام توند لە ئامێزم گرت وتم:

- وەکوو مونام بێکەس و بێ نازی دایکتانن.

دواتر بۆشم دەرکەوت کە ئەم منداڵانە باوکشیان بە جێی هێشتوون واتە ئەم منداڵانە وەکوو من بوون بەڵام من دایکم جێیهشت بووم ئەوان باوکیان. دوای ئەم ڕووداوانە کە پڕ بوون لە ناهەمواری دوای تێپەڕبوونی چەندین ساڵ ژیان من توانیم زانکۆ تەواوکەم و هاوسەرگیرم کرد .بوومە خاوەنی منداڵێک باوکم وەکوو پێشتر نەما دوای ئەم ڕووداوانە توانای ئیشکردنی نەما بۆیە کاروباری کۆمپانیای دایە هاوسەرەکەمەوە لە هەمووی گرنگتر من بڕیارم دا منداڵەکانی دایکشم بەخێوبکەم منداڵەکانم گرتە ئەستۆی خۆم و ئەوەبوو کە توانیم لە ژێر یەک سەقف خێزانەکەم کۆبکەمەوە بەڵام دوای ئەوە کە توانیم وەڵامی هەمووپرسیارەکانم بدۆزمەوە. دایک واتە سۆز واتە قوربانیدان بەڵام دوای دایک سەبووری ماڵ باوکە چونکە مونام گەر باوکی نەبا هەرگیز نەیدەتوانی ببێتە مونام.

## له نێوان ژیان و مردن

من کوڕێکی پڕ له نائومێدی بووم! ناوم "ڕەوێن"ە له پەیمانگا له بەشی ئینگلیزی دەمخوێند یەکێک بووم له قوتابیه زیرەکەکان هەمیشه ئاواتم بوو ببمه مامۆستا بۆیه زۆر هەوڵمدەدا. ئێمه له خێزانێکی پێنج کەسی پێکهاتبووین من منداڵی گەورەی ماڵ بووم خوشک و برایەکی له خۆم بچووکترم هەبوو. ناویان "سارا" و (نامۆ) بوو له ڕووی داراییەوە، هەتا باوکمان مابوو دەتوانم بڵێم تا ڕادەیەک باش بووین. چونکه به هەر جۆرێک بوو ئەو هەمیشه به سەختی کاری دەکرد بۆ ئێمه هەمیشه به منی دەگووت: «ڕەوێن تۆ تەنها بخوێنه، من بڕوام به تۆیه تۆ دەبی به مامۆستایەکی زۆرباش» هەمیشه گوتراووه باوک وەکوو سەقفی خانووه بۆ خێزانەکەی. که ڕێگا له هەموو بەربەستەکان دەگرێت وه تەواوکەری باوکیش دایکه، دایکم ژنی ماڵەوە بوو واته کاری نەدەکرد. خێزانێکی بەختەوەر و خنجیلانه بووین. ڕاسته ئێمه دەوڵەمەند نەبووین... لەسەر سفرەی گرانبەها و خواردنی

جۆراوجۆر نەژیاین! بەڵام هەرگیز زەردەخەنە جیانەدەبوویەوە لێمان... ڕۆژگار ڕۆشت، تا ڕۆژێک باوکم تووشی ئازارێکی زۆر بوو لە دڵی. زۆر دەمێک باوکم وابوو بەڵام لەبێ پارەی نەدەچوو بۆ نەحۆشخانە! بۆیە دەی وت هیچ نییە لەوانەیە بە هۆی کارکردن بێت. تا ڕۆژێک باوکم لەهۆشخۆی چوو لە تاو ئازارەکە بردمانە نەخۆشخانە. باوکم دوا هەناسەی دا لە ژێر دەستی دکتۆرەکان ئێمە سەفقی خانوومان ڕووخا باران و ڕەشەبا زۆر بەئاسانی تێپەڕبوو. مەبەستم باوکم بوو، ژیان دوای باوکمان زۆر زەحمەت بوو پڕاوپڕ لە ناخۆشی. چونکە پارە پەیداکردنی ئێمە بە دەستی باوکمان بوو. بۆیە کەوتینە بارودۆخێکی زەحمەت تەنانەت زۆرجار تا بەیانی لە برسان دەماینەوە و هیچ شتێک نەبوو بۆ خواردن. من بە تەواوی بێ ئومێد بووم زۆر جار دەچووم بۆ سەر گۆڕی باوکم هەرچی ئازارم هەبوو بۆ ئەوم باس دەکرد نقومی گریان دەبووم لەسەر گۆرەکەی. بۆیە لە ناچاری ژیان بڕیارێکی زۆر سەختم دا نەمتوانی تا کۆتایی بەم شێوەیە بم .ئەویش ئەوە بوو وازم لە خوێندن هێنا دەستم بە کارکردن کرد. وەکوو کرێکارێک لە یەکێک لە بیناکان! ئای چەند ناخۆش بوو ئاواتی چەند ساڵی مامۆستایم چووە ژێرگڵ ئەو حەزە پڕ جۆش خرۆشەی ژیانم چووە ناو گۆرێکی مات و خنکاو. دەستم بە کارکردن کرد لە بیناکە وەکوو کرێکارێک، خاوەنی بیناکە کەسێکێ زۆر دەوڵەمەندبوو کاری ئەو تەنها درووستکردنی بینا و خانوو بوو. سەرەڕای ئەو هەموو پارە و دەوڵەمەندییە بەڵام کەسێکی زۆر دیندار و خواپەرست بوو. هەرگیز بەشێوەیەکی ڕەق مامەڵەی لەگەڵمان نەدەکرد. بە ڕاستی

بێ وێنە بوو. ئاخ لەم وڵاتەی ئێمە ئەو جۆرە کەسانە چەند کەمن! کاتێک پارە دەبینن نەگۆڕێن. تەنانەت لە قورئانیش باسی چاکەکارکراوە زۆر بە جوانی.

ڕۆژێک خەریکی کارکردن بووم هەر بیرم لای باوکم و ئاواتی بوون بە مامۆستا بوو. لە ناکاو هۆشم نەما کەوتمە خوارەوە لە بیناکە. دوای ئەوە ژیانم کەوتە باری خەو لە نێوان ژیان و مردن ئەو قسانەی ئێستا دەیڵێم دایکم باسی دەکا کە چۆن ژیانم بەڕێ کردووە. لە گۆشەی نەخۆشخانە کە منیان بردۆتە نەخۆشخانە من خەڵتانی خوێن بووم، هیچ ئومێدێک نەبوو بۆ چاکبوونەوەم. دایکم وەکوو هەر دایکێکی تر تەنیا دەگریا و نزای دەکرد و دەپاڕایەوە. لەژێر ئامێر و ئۆکسجینی نەخۆشخانە مامەوە. دایکم وتی: «بۆ ماوەی مانگێک کەوتیە باری بێ هۆشی جەستەیەکی بێ جوڵە، بێ قسە! ژیانێک وەکوو خەوێک بێ ڕۆح.» تا ڕۆژێک لە ناکاو لەو خەوە رزگار بووم کەسێک وتی: «ڕەوێن هەستە بەسە تۆ زۆر خەوتی هەستەوە خێزانەکەت پێویستان پێتە» دایکم وتی: «لە ناکاو چاوەکانت هەڵێناو دەستت جوڵاند منیش زۆر بەخێرای بانگی دکتۆرەکانم کرد.» ئەزانی کاتێک یەکەم جار چاوم هەڵێنا چیم بینی دکتۆرێک وتی: «ئای خوایە بەڕاستی تۆ میهرەبانی تۆ بەخشندەی. ماشاءالله لە کاری خوا» منیش ئەوکاتە زانیم من بێئاگا لە زاتی خودا! بێ ئاگا لەوەی کەسێک هەیە لە سەرەوەی خۆم. دوای مانگێ لە نەخۆشخانە گەڕامەوە سەر ژیان بەڵام بەبێ قاچ! چونکە من تووشی ئیفلیجی قاچ بووم... ئێستا دوای تێپەڕبوونی چەند ساڵێک من بەعارەبانەیەک دەچم بۆ پیشەکەم، بۆ قوتابخانە... من ئێستا مامۆستام نەوەیەک فێردەکەم! وایە قاچم

نییە بەڵام ئێستا زۆر شوکرم بە زاتی خودا چونکە ژیانم هەیە. ئەزانی چۆن گەیشتم بەو ڕۆژە؟ کێ بوو وایکرد بخوێنمەوە؟ دووبارە خاوەنی پارە و ماڵی خۆمان بین هەمان ئەو پیاوەی کە خاوەن کاری من بوو. کاک ئیبراهیمی خاوەن کارەکەم کە ئیشم لای دەکرد ئەو بوو.

# زوڵم

من ناوم "سۆما"یە لە منداڵییەوە بە کۆمەڵێک ڕووداوی پڕ لە ناخۆشی و زوڵمی باوکم و خێزانەکەم ژیاوم. وەکوو منداڵەکانی تر نەمتوانیوە ژیانی منداڵیم ببەمەسەر. من برایەکم هەبوو بە ناوی "ڕێبوار" ئەو گەورەتر بوو لە من. ئەو وەکوو من نەبوو! هەرچی دەیویست و حەزی پێی بکردایە، دەیکرد. باوکم بێدەنگ دەبوو، بەرامبەری لەبەر ئەوەی ئەو کوڕ بوو، پیاوی ماڵ بوو... کاتێک مەسەلەکە دەهاتە باسی من... باوکم وەکوو شێتی لێدەهات و دەیگووت: «نابێت کچ بخوێنێ! کچ  ئیشکردن و خزمەتی ماڵیان ووتوە، نەک خوێندن... باوکم هەمیشە جوێنی بە من دەدا و لێیدەدام! بەهۆی کەلتوور و قسەی ناو بنەماڵەکەی هەمیشە

پەیوەست بوو، وەکوو کۆیلەی لێهاتبوو... بۆیە منی دەرهێنا لە قوتابخانەوە و وتی:

- لەمەودوا تۆ بەس ئیش دەکەی، چیتر ناخوێنی
- باوکە من حەزم لێیە بخوێنم! ئەی بۆ براکەم دەخوێنی؟ منیش مرۆڤم! منیش لە خوێنی تۆ نیم؟ تەنیا لەبەر ئەوەی من قژم هەیە؟ براکەم کوڕە و پرچی کورتەوە ئازادە... ئاخر بۆچی؟

باوکم بە قایشەکەی پشتی کەوتە گیانم. زۆری لێدام منیش دوای ئەوە بێدەنگیم هەڵبژارد و دەستم بە ژیان کردەوە. دایکم وەفاتی کرد بە هۆی نەخۆشی و براکەم چووە زانکۆ. لەوێ ئاشقی کچێک بوو. بە باوکمی وت: «دەبێت بچیتە داوای» باوکیشم چووە داوای.ماڵی کچە مەرجەی ئەوەیان هەبوو کە دەبێت کچەکەیان خویندن تەواو بکات. باوکم لەبەرئەوەی مەسەلەکە ڕێبواری کوڕی بوو، بۆیە وتی: «جا چییە با بخوێنێ بوکەکەم.» ئەی باشە بۆچی، منیش کچ نەبووم؟ منیش وەکوو ئەو پرچم نەبوو؟ منیش وەکوو ئەو لە بوونی کچ نەبووم؟ بەڵام لەبەر برام بێدەنگیم هەڵبژارد، چونکە خوشک لە پێناو برا گیانی خۆشی دەکاتە قوربانی! ڕۆژگار تێپەڕی براژنەکەم منی وەکوو خزمەتکار دادەنا. هەر بەیانی دەچووە دەوام و ئێوارە دەهاتەوە و دەیگووت:«کچێ هەی پیسی ناشیرین، بۆ شتێکت ئامادە نەکردووە؟ بە خۆت و باوکە پیرەکەت نازانم بۆچی ون نابن، نامرن...» ئەو قسانە

وەکوو تیر بە گیانم دەکەوت بەڵام بێدەنگم هەڵبژارد لەبەر برام. باوکم کەوتە تەمەن و تووشی نەخۆشی دڵ بوو زۆری نەبرد نەخۆشیەکەی بەسەریدا زاڵ بوو و کوشتی. من مامەوە بە تەنیا لە نێوان زوڵمی براژنەکەم .کە تەنانەت کار گەیشتە باری لێدان و سوتانی جەستەم و جوێندان! شەوێک سەرمایەکی زۆر و بەفر بوو براژنەکەم وتی:

- کچی ناشیرین. ئەوە بۆ جلەکانی منت ئوتوو نەکردووە؟
- ببورە براژن زۆر نەخۆش بووم نەمتوانی. ئێستا بۆت دەکەم.

ئەویش زلەیەکی لێدام وتی:

- هەی پیسی ناشرین تۆ خۆت بە چی دەزانی ها ونبە و برۆ دەرەوە لەو ماڵە.

براکەم لەو کاتە هاتەوە ماڵەوە و بەسەر شەڕەکە هات وتی:

- چی بووە سۆما خوشکم؟

براژنەکەم هاتە وەڵام و وتی:

- من چیتر بەرگەی ئەم خوشکەت ناگرم. ئەو فێری دزی بووە پارە دەدزێ یان زێرەکانم. ئەوە زۆر دەمێکە هەستم پێکردووە، ڕێبوار... بەس لەبەر دڵی تۆ هیچم نەوتووە بەڵام خوشکت بێتامی کردووە.

براکەم، سەیرێکی کردم وەک بڵێی خوشکی نەبم وتی:

- سۆما دزی دەکەی؟
- باوەڕبکە دزیم نەکردووە تۆ خۆت خوشکەکەت دەناسی من چۆن شتی وا دەکەم کاکە؟

بەڵام براکەم لەبەر ژنەکەی ئەو خوشکەی کە لە خوێنی یەک بوون وێڵی کرد و باوەڕی بە ژنەکەی کرد و منی فڕێدا بۆ دەرەوە منیش وتم:

- تکایە کاکە من بچمە کوێ بەم سەرمایە من خوشکی تۆم.
- لاچۆ دز سەرەتا بیرت لەو شتە کردبایەوە، نەک ئێستا...

براژنەکەشم لەولاوە بە زەردەخەنەیەکەوە سەیری دەکردم وەکوو بڵێ سۆما من کارە سپڵەکەم سەری گرت... دەرگایان لەسەر داخستم... منیش کەوتمە سەر شەقام لەتاو سەرما و سۆڵ لە هۆش خۆم چووم کە چاوم کردەوە لە ماڵێک بووم کە سۆپایەکی گەرم و ماڵێکی خنجیلانە بوو. دوای ئەوە پیاوێک و ژنەکەی هاتنە ژوورەوە .لەگەڵ کوڕێکیان وتی:

- کچم مەترسێ ئێستا باشی وا خواردنم بۆ هێناوی.

دوای ئەوە ژنەکە سەیرێکی منی کرد و وتی:

- کچێکی وەکوو تۆ جوان چۆن لەسەر شەقام و بەم سەرمایە کەوتووی تۆ خێزانت نییە؟

منیش بە چاوێکی پڕ گریان بەسەر هاتی خۆم گێڕایەوە. ئەوانیش وتیان:

- بەڕاستی سەد ئەفسووس بۆ ئەم برایە! زۆر زوڵمیان لێکردووی بەس تۆ خەم مەخۆ لێرەبە تۆ وەکوو کچی ئێمەی، ئێمە تەنیا ئەم کوڕەمان هەیە .خوا کچی پێنەبەخشیوین. بەڵام تۆ وەکوو کچی ئێمەی. دوای تێپەڕبوونی چەند مانگێک لەو ماڵە ڕاهاتبووم، زۆر بەختەوەر بووم. دوای ئەوەی بوومە بووکی ئەم ماڵە واتە هاوسەرگیرم لەگەڵ کوڕی  ئەو ماڵە کرد کە ناوی "سەربەست" دوای ساڵێک بوومە خاوەنی کوڕێک ناوم نا "سەرکەوت" ڕۆژێک لە بازاڕ بووم لە ناکاو پیاوێکی قژ درێژ و بەڕیشەوە هاتە بەردەمم وتی: «تکایە یارمەتیم بدە» منیش کە سەیرم کرد چیم بینی ئەزانن کێ بوو براکەم ڕێبوار وتم:
- برام ئەوە تۆی بۆ وات لێهاتووە؟

ئەویش وتی:

- سۆما!

لە کوڵپی گریانیدا کەوتە سەر چۆک و وتی:

- سۆما بمبورە تکایە!

منیش دەستم لە سەر شانی دانا و وتم:

- خودا هەر خۆی بەخشندەیە، هەر ئەو بەسۆزە... بەس تۆ بۆ وات لێهاتووە براکەم؟
- سۆما چیت بۆ باس بکەم! دوای ڕۆیشتنی تۆ ژنەکەم تووشی نەخۆشی پێست بوو. بەهۆی چارەسەری زۆرەوە

کەوتمە ژێر قەرز ئەویش لێم جیابوویەوە! دەبینی ئێستا حاڵم چۆنە! ئەمەش بە هۆی زوڵمی ئێمەیە بەرامبەر تۆ وامان لێهات... تکایە سۆما بمبوورە! زوڵممان لە تۆ کرد.

منیش وتم:

- نا دەبێت خودا  لێتان ببووریَ. ئەوە بزانە هیچ کاتێک خوشک ناتوانیَ لە براکەی تورەبێت. ئەوە بزانە ئەو کەسەی زاڵمە، دوا ڕۆژی هەر پەشیمانییە و قیامەتی هەر دۆزەخە...

## ماده‌ی هۆشبه‌ر ژیانی بردم

زۆرێک له‌و کچ و کوڕانه‌ی ئه‌م شاره‌ی ئێمه؛ که که‌وتوونه‌ته ژێرباری مه‌ترسی مادده‌ی هۆشبه‌ر، که ئه‌م مه‌ترسییه زۆربه‌ی کچ و کوڕه جوانه‌کانی کۆمه‌ڵگای ئێمه‌ی خنکاندووه. منیش یه‌کێکم له‌و قوربانیانه‌ی که بێبه‌ش نه‌بووم له‌م مه‌ترسییه. من کچێکم له‌م هه‌زار کچه، که ژیانم تاڵ بوو به بوونی هاوڕێی خراپ و به‌کارهێنانی مادده‌ی هۆشبه‌ر. ناوم "سه‌روین"ه. له زانکۆ ده‌مخویند. هه‌موو ساڵێ یه‌کێک بوومه، له قوتابییه هه‌ره زیره‌که‌کانی پۆله‌که‌م. هه‌میشه ناوم له ڕیزی یه‌که‌مه‌کان بوو و جێگه‌ی شانازی خێزان و هاوڕێکانم بووم. بێجگه له خۆم، دوو خوشک و برایه‌کم هه‌بوو؛ که براکه‌م له ئێمه بچوکتر بوو باوکم ئیشی ته‌کسی ده‌کرد و دایکشم مامۆستا بوو. ژیانم زۆر باشبوو

له خۆشیدا دەژیاین ئێمە داوای هەرچیمان کردبا بۆیان دەکردین ئێمە ئازادبووین چۆن دەژین و دەخۆین و دەڕۆینە دەرەوە. ئەگەر بێینە باسی من؛ کەسێکی زۆر سەرەڕۆ بووم. واتە هیچ پابەندنەبووم بە ئاین و نوێژ. بەردەوام خەریکی چوونەدەرەوە و کەیف و سەفای خۆم بووم. حیجاب نەبووم، وام دەزانی حیجاب جوانییەکانی من دەشاریتەوە. بەڵام خوشکێکم کە له خۆم گەورەتربوو ئەو زۆر بە دین و کچێکی پاک و چاک بوو. هەمیشە ئامۆژگاری دەکردم و دەیگووت:

- سەروین ئێمە لەسەر ئەم زەوییە کاتین، ڕۆژێک دێ دەمرین. بۆیە با بە جوانی بگەڕێینەوە لای خودا. بۆ حیجاب ناکەی؟ کە خودا حیجابی فەرز کردووە لەسەر ئێمە. لە قورئانی پیرۆزدا باسی حیجاب دەکات و دەفەرموێت:

(وَقُل لِّلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَى جُيُوبِهِنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا لِبُعُولَتِهِنَّ أَوْ آبَائِهِنَّ أَوْ آبَاء بُعُولَتِهِنَّ أَوْ أَبْنَائِهِنَّ أَوْ أَبْنَاء بُعُولَتِهِنَّ أَوْ إِخْوَانِهِنَّ أَوْ بَنِي إِخْوَانِهِنَّ أَوْ بَنِي أَخَوَاتِهِنَّ أَوْ نِسَائِهِنَّ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُنَّ أَوِ التَّابِعِينَ غَيْرِ أُوْلِي الْإِرْبَةِ مِنَ الرِّجَالِ أَوِ الطِّفْلِ الَّذِينَ لَمْ يَظْهَرُوا عَلَى عَوْرَاتِ النِّسَاء وَلَا يَضْرِبْنَ بِأَرْجُلِهِنَّ لِيُعْلَمَ مَا يُخْفِينَ مِن زِينَتِهِنَّ وَتُوبُوا إِلَى اللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَا الْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ.) النور: (31)

واتە: **ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بڵێ بە ئافرەتە ئیماندارەکان، با چاویان بپارێزن لە سەیر کردنی پیاوی بێگانە. وە با داوێنی**

**خۆیان بەدوور بگرن لە بەدڕەوشتی. وە جوانی و ڕازاوەیی و زینەتی خۆیان بەدەرنەخەن بۆ نامەحرەمەکانیان. وە با لەچک و سەرپۆش بەسەرو سنگیاندا بێتە خوارەوە. وە با لە کاتی ڕۆیشتنیاندا قاچیان نەدەن لەزەوی یەکە و تەقە تەق بکەن، بۆ ئەوەی بزانرێت چ زینەتێکیان شاردۆتەوە. ئەی ئیمانداران هەمووتان تۆبە بکەن و بگەڕێنەوە بۆ لای خوای پەروەردگار چونکە ئەمە مایەی سەرفرازیتانە.**

خوای گەورە فەرموویەتی: (يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَاجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَاء الْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلَابِيبِهِنَّ ذَلِكَ أَدْنَى أَن يُعْرَفْنَ فَلَا يُؤْذَيْنَ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا) الأحزاب (59)

واتە: **ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمان بدە بە خێزانەکانت و کچەکانت و خێزانی باوەڕدارانیش -چونکە خێزان و کچەکانی پێغەمبەر نزیک ترین کەسن لێیەوە ئەوان لە پێشترن لە بەجێ گەیاندنی ئەم حوکمە- بەوەی کە عاباکانیان بە سەریاندا بدەن، تا ئافرەتانی موسڵمان بە جل و بەرگەکانیانەوە بناسرێنەوە. بەوەی کە بە حەیا و قورس و سەنگینن تاوەکو ئەزێت نەدرێن، وە خوای گەورە بەبەزەییە بەرامبەر ئەوانەی کە لەمەوپێش خۆیان نەپۆشیوە.**

- بۆیە خودا فەرمانمان پێدەکات، ئێمە چۆن پەیڕەوی نەکەین! خوشکەکەم...

منیش پێدەکەنیم دەمگووت:

- تۆش سەیری ها! بۆ وا خۆت پیر کردووە؟ بەردەوام لە ماڵەوە خەریکی نوێژی! وەرە تا گەنجی کەیف و جەوی خۆت وەرگرە. ژیان کورتە! خوشکم سابات...

بەڵام نەمدەزانی ڕۆژگار پێچەوانەیە. جاروبار زۆر نەفام و گەوج بووم بە قسەی ساباتی خوشکم نەدەکرد. هەر بەردەوام بووم لەم ڕێگایە... ڕۆژێک لە زانکۆ دانیشتبووم لە کافتریا. "سانا"ی هاوڕێم هات لەگەڵ کوڕێک وتی:

- سڵاو سەروین ئەمە "ئەحمەد"ە. هاوڕێی منە حەزی کرد تۆ بناسێ
- سڵاو ئەحمەد.

ئەویش وتی:

- سڵاو خۆشحاڵ بووم بە ناسینت.
-

دوای ئەوە دانیشتین سانا وتی:

- سەروین ئەمشەو بەنیازین، بچینە دەرەوە، لەگەڵ ئەحمەد. تۆش وەرە...
- ناتوانم. ئەمشەو ماڵەوەمان دەڕۆنە ماڵی خاڵ. من ناتوانم بێم.
- کچێ تۆش ترسنۆکی ها! تۆ کەی وا بوویت درۆیەک بکە بڵێ نەخۆشم.

ئەحمەدیش هاتە قسە و وتی:

- من حەزدەکەم بێی زۆر خۆشحاڵ دەبم.

منیش لە ئاست قسەکانی ئەو نەمتوانی هیچ بڵێم و وتم:

- باشە بزانم چۆن دەبێت.

بۆیە گەڕامەوەماڵەوە بەڵام بەردەوام بیرم لای ئەحمەد بوو بۆیە وتم:«بە هەر جۆرێک بێت دەبێت بچم.» لەم کەین و بەینەدا بووم باوکم هاتە ژوورەوە وتی:

- سەروین ئێمە دەڕۆین، خۆت ئامادە بکە.
- باوکە نەخۆشم، ناتوانم بێم.
- باشە کێشە نییە، مادەم بۆ خۆت پشوو بدە.

منیش ئاهێکم هەڵکێشا وتم خوایە زۆر شوکر. دوای چەند کاتژمێرێک ئەحمەد و سانا هاتن منیش چوومە پێشەوە چاوم گەشاوە  کە چاوم بە ئەحمەد کەوت. بە بێ ئەوەی سەیری دواوەی خۆم بکەم کە خێزانێکم بە جێ هێشتووە. لە ناو سەیارە سانا وتی:

- سەروین ئێمە دەچینە ماڵی ئەحمەد ئەوان هەموو لەوێ کۆبوونەتەوە.
- ئاخر ئێوە باسی ماڵی ئەحمەدتان نەکرد.

ئەحمەدیش بەجواب هات و وتی:

- چییە حەز ناکەی بێیت.

منیش لە ئاست ئەو دووبارە بێ زمان بووم، بۆیە ڕازی بووم. گەیشتینە ماڵی ئەحمەد لەوێ کوڕان و کچان کۆببوونەوە. من هیچ هەستم بە باشی نەدەکرد بۆیە چوومە لای سانا و وتم:

- با برۆین ئێرە باش نییە.
- کچێ تۆش کەیفی خۆت وەرگرە.

منیش دانیشتم لە ناکاو کەسێک کۆمەڵێک شتی سەیر و دەرزی هێنا. من سەرەتا نەمزانی چییە! بەس دواتر هەموو ئەم شتانەیان هەڵدەکیشا و دەرزیان لە دەستی دەداین. کەوتمە بارودۆخێکی سەیر... ئەوکاتە زانیم ئەمە ماددەی هۆشبەرە بۆیە هەستام و وتم:

- ئەمە چییە  ئەم بارودۆخە! سانا ئێوە چی دەکەن؟

ئەحمەد  وتی:

- دانیشە سەروین ئەمە شتێکی ئاساییە، تۆش بەکاری بهێنە... باوەڕبکە وات لێدەکات هەست بەخۆشی بکەیت.

بەم قسە و باقوبریقانە منیان فریودا. ئەوە بوو بەکارم هێنا، تا وای لێهات وا ئاڵودەبووم کە هەموو ڕۆژێ داوام دەکرد. بۆ بەدەست هێنانی، پارەم لەماڵەوە دەدزی. وا ئاڵودەببووم کە زانکۆم هەر بیر نەبوو، هەر نەدەچووم... ڕۆژێک خوشکەم سابات هەستی کرد کە من کەوتوومەتە چ بارودۆخێکەوە بۆیە وتی:

- سەروین وازبهێنە. ئێستاش زووە بۆ ئەوەی واز بهێنی لەم شتانە.

منیش هاوارم کرد وتم:

- تۆ حەقت نەبێت ئەوە ژیانی خۆمە!

ئای چەند نەفام بووم! چەند گێل و خەڵەفاوبووم! ژیانم بوویە ژیانێکی پیس و بۆگەن. ئەم شەوە لە ژیانم قەد لەبیرناکەم وەکوو شەوێکی تارمای بوو بۆ ژیانم. کە هەموو ژیانم لەدەستدا لەو شەوە .ئەوەبوو وەکوو جاران بۆ بەدەست هێنانی بڕێکی زیاتر لەو ماددەیە چووم بۆ لای ئەحمەد .ئەویش منی برد بۆ ئەو شوێنە. دوای ئەوە لەوێ بڕێکی زۆر زیاترم بەکارهێنا. زۆر زیاتر لەوانەی پێشووتر! بە تەواوی وەکوو شێت بووم! هەردووکمان کەوتبووینە بارودۆخێکی زۆر پیس و شەرمەزارانە. دوای ئەوە ئەحمەد وتی:

- سەروین دەتبەم بۆ ماڵی خۆمان ئەمشەو لەوێ دەمێنینەوە.

منیش چونکە بێهۆش و مەست بووم زمان تەتەڵەی دەکرد. وتم:

- باش... باشە...

لە ڕێگا زۆر بە خێرای دەڕۆشتین. لە ناو گۆرانی وتن و زۆنگاوی پیسەکان نقووم بووین. تا ئەوکاتەی تووشی ڕووداو بووین! من هەر وامزانی لە خەودام تا ئەو کاتەی بە هۆش خۆم هاتمەوە، لە گۆشەکانی نەخۆشخانە بووم. دوای ئەوەش کە

ئەحمەدیش لەم رووداوە بە هۆی زۆری مرد. منیش خێزانەکەم و زانکۆکەم و هەموو شتێکم لە دەستدا. ئێستا کەوتوومەتە باری زیندان و چارەسەر وەرگرتن. بۆیە تکایە لە هەڵبژاردنی هاوڕێ زۆر ئاگاداربن وە هەمیشە بە گوێی خێزانەکانتان بکەن با وەکوو من نەبن...

## مامۆستاکەم

لە پەنجەرەی ژوورەکەمدا، سەیری خۆرئاوابوونم دەکرد. کە چۆن خۆرماڵئاوایی دەکات، تا بەیانی. زۆر بەئاسپایی و هێمنی چاوەکانم دەڕوانییە ئەم خۆرئاوابوونە و لە بیری خۆم سەرقاڵی کۆمەڵێک شیکارکردن و وێنەکردنی خودی خۆم بووم. لەناو ئەم فکرانەدا بووم. هزرم کەوتە سەر کتێبێک کە لەناو دۆلابەکەم بوو. دۆلابەکەم کردەوە سەیری کتێبەکەم کرد. بۆیە کتێبەکەم دەرهێنا و لەسەر کورسیەکە دانیشتم. دەستم کرد بە خوێندنەوەی کتێبەکە. کە ناونیشانی کتێبەکە بریتی بوو لە "مامۆستاکەم" لە پەڕی یەکەمی کتێبەکە نووسرابوو:

"ئەم کتێبەی من باسی ژیانی قوتابیەک دەکات کە چۆن توانی خۆی بدۆزێتەوە. ئەویش بە هۆی مامۆستایەکەوە بوو. من لێرە لەم کتێبە ئەم بەسەرهاتەی خۆم نوسیوەتەوە بۆ ئەوەی دوای

مردنم خێزانەکەم یاخود منداڵەکانم بیخوێننەوە و بزانن کە چۆن "کامۆ" قوتابییە بێدەنگەکە گەیشتە ئەم ئاستە."

منیش هەر بەردەوام بووم لەخوێندنەوەی دوای ئەوە چوومە پەڕەی دواتر:

"چیرۆکی ژیانی من لە قوتابخانەی سەرەتاییەوە دەست پێدەکات کە من تا بڵێی قوتابیەکی بێدەنگ بووم بەردەوام بە هۆی تەمبەڵی و بێ ئاگایم بە دوای دایک و باوکمیان دەنارد و دەیانگووت: «بە ڕاستی کوڕەکەت شایەنی ئەوە نییە بێتە قوتابخانە. ئەو هی ئەوەیە بچێت کار بکات! بەخوا باپێت بڵێم کاریش بۆ ئەوە گوناحە» باوکیشم بە هۆی ئەو قسانە هەستی بە شەرمەزاری دەکرد بۆیە بەردەوام کاتێک دەهاتەوە سەرزەنشتی دەکردم و دەیگووت: «تۆ گێڵی نەفامی ئاخر لە چیت کەمە ها بۆ ناخوێنی هەمیشە شەرمەزارم دەکەی لای خەڵک و مامۆستاکانت! تۆ سەیری کوڕی خەڵک بکە چۆن دایک و باوکیان سەربڵند کردووە. تۆش هەروا بێدەنگ و گێڵ دەبیت.. هەر بێسوود.» دواتریش تفێکی لێدەکردم و سزای دەدام. سزاکەشی ئەوەبوو کە پارەی پێنەدەدام بۆ قوتابخانە یان ڕێگەی بە چوونەدەرەوەم نەدەدا. تەنانەت ڕێگەی نەدەدا لە سەرمێزی نانخواردنیش دابنیشم. لە سەرەتا هێندە دەگریام چاوەکانم سوور دەبوویەوە. لەشم هێزی نەدەما یەکسەر دەخەوتم. بەڵام دوایی زانیم ئەمە ڕۆتینی ژیانمە.

بۆیە تارادەیەک لام ئاسایی بوو بە سزدانی باوکم ڕاهاتبووم... شەوان بە سزادانی باوکم و ڕۆژانیش دەچومەوە بۆ قوتابخانە. لە بێبەختی خۆمیش، لەوێش لەو سزدانە بێبەش نەدەبووم... کاتێک لەناو پۆل دەبووم مامۆستاکەم پرسیاری دەکرد منیش بەبێدەنگی سەرم شۆر دەکرد. مامۆستاکەشم دەیگووت: «کامۆ تۆ وەڵامی ئەم پرسیارە چییە؟» منیش هیچ وشەیەکم نەدەگووت تەنیا سەیری مامۆستاکەم دەکرد و ئەویش دەیگووت: «چییە پشیلە زمانی خواردووی؟ بۆ قسەناکەی گێلە؟» قوتابییەکان پێدەکەنین و گاڵتەیان پێدەکردم. بۆیە منیش تورە دەبووم دەچومە دەرەوە تا شوێنێک ڕانەدەوەستام. کە ئەویش شوێنێک بوو، کە کەس نەیدەزانی تەنیا خۆم و خودای خۆم نەبێت... لەوێ دووبارە دەگریام سکاڵام لای خودا دەکرد. سکاڵاکانیشم هەر بە بێدەنگی بوو. چونکە لەبێدەنگی ڕاهاتبووم توانای دەربرینی وشەیەکم نەبوو بۆیە قسەکردنیشم لەگەڵ خودا بە بێدەنگی بوو. بەڵام جوانی گفتوگۆی خۆم و خودا ئەوەبوو، ئەو بێدەنگی مرۆڤەکانیشی قبوڵ دەکرد. دوای ئەوە ئاسوودە دەبووم و دەگەڕامەوە ماڵەوە دەچوومە ژوورەکەم و یەکسەر دەخەوتم بێ ئەوەی جلەکانم بگۆڕم و نان بخۆم. چونکە دەمزانی من ئەمشەو هەر بێبەش دەبم لە خواردن بەهۆی سزای باوکم بۆیە هەر بەڕێکی و بێ کێشە نەدەچوومە سەر مێزی نانخواردن. بەڵام ئێستا بیردەکەمەوە؛ من هەمیشە بە کەسێکی نەفام و گێڵ

دەناسرام، ئەویش بەهۆی ئەوەبوو کەسێک یان مامۆستایەک نەبوو لەلام دانیشێت و قسەم لەگەڵ بکات دەستی بە سەرم دابێنێ و ئامۆژگاریم بکات. من هەمیشە زانیومە مامۆستا باوک یان دایکی دووەمتە. بەڵام هەندێ مامۆستا هەن کە ئەسڵەن لەپیرۆزی مامۆستا کەم دەکەنەوە لە جیاتی ئەوەی ورەی قوتابی بەرز بکەن زیاتر شکست بە قوتابی دەهێنن... لەوکاتەی تەمەنی منیش، مامۆستاکانی من وابوون بەڵام من نەمدەزانی ژیان وەکوو میلی کاتژمێر پیچەوانەشی هەیە. ژیانی منیش وەکوو کاتژمێربوو پێچەوانەیەکی سەیر  روویدا."

منیش زۆر بە حەسرەت بووم بۆ تەواوکردنی بەڵام لە ناکاو دایکم لە دەرگایدا و وتی: «وریا وەرە نان بخۆ.» منیش پەرتووکەکەم داخستوو ڕۆیشتم. دوای بەیانی لە قوتابخانە هەر بیرم لای تەواوکردنی ئەم چیرۆکە بوو. بۆیە زۆر بە خێرای دوای تەواوکردنی قوتابخانە. یەکسەر بەرەو ماڵەوە گەڕامەوە. دوای سڵاوکردن لە دایکم زۆر بەخێرای بە پلیەکانەکان دەچومەوە سەرەوە دایکم وتی: «وریا چییە بۆ وا بەپەلەی؟ ئاگاداربە، دەکەویت!» بەڵام من هێندە بە حەسرەتی کۆتایی چیرۆکەکە بووم بۆیە بێ ئاگابووم لە هەموو شتێک چوومەوە ژوورەکەم و دەستم کرد بەتەواوکردنی چیرۆکەکە لە کوێ بووین ئاها لەو شوێنە بووین کە ژیانی ئەو وەکوو میلی کاتژمێر پێچەوانەبوو:

"ڕۆژێک وەکوو جاران چوومەوە بۆ قوتابخانە قوتابیەکان دەیانگووت: «ئەمڕۆ مامۆستای نویٚ دێت ناوی مامۆستا "هیوا"یە. دەبێت چۆن بێت؟» ئەو قسەوباسەبوو لە ناو قوتابیان منیش بیرمکردەوە و وتم: «بەخوا دووبارە بەمەش ئابڕووم دەچێت. ئەویش وەکوو ئەوانەی تر فڕێم دەداتە دەرەوە. بۆیە خۆم ئامادە دەکەم.» بە بێدەنگی دانیشتم. مامۆستاکە هاتە ژوورەوە ودانیشت منیش هەر سەرم بڵند نەکرد. هەر سەیری روخساریشیم نەکرد ئاخۆ چۆنە؟ زۆر دەترسام! مامۆستا هەستایە سەرپیٚ و بە دەوری ئێمەدا دەسوڕایەوە. دەستی بەقسەکردن  کرد و وتی: «سڵاو قوتابیان من مامۆستای نویٚم. لێرە بەدواوە من وانەتان پێدەڵێم. تا کۆتایی ساڵ، لای ئێوە دەبم...» لەم  کەین و بەینەیا دەستی بەسەری قوتابییەکان دادەهێنا و پێدەکەنی لەگەڵیان. مامۆستاکەش هەر بەردەوام بوو دەیگووت: «مرۆڤ کاتێک لە دایک دەبێت بە کۆمەڵێک خۆزگە و ئاوات دەست بە ژیان دەکات، کاتێک منداڵە دەیەوێت بەسەرپیٚ بکەوێت و بڕوات. وە کاتێک گەورە دەبێت دەیەوێت بچێتە قوتابخانە و پلەی باش بەدەست بهێنێت و بڵیٚ من سەرکەووتووم. جا لە هەمووی گرنگتر بڵیٚ من یەکەم بووم. دکتۆریم یان ئەندازریم هێناوە! ئەویش لەبەر خۆی نا لەبەر کۆمەڵگە و خێزانەکەی بەس دڵی ئەو وەکوو توێکڵێکی بەتاڵە هیچ تێدانییە. ئێمە هەمیشە وادەزانین گەر کەسێک یەکەم بوو تەواو ئەوە سەرکەوتووە پاڵەوانە یان ئەگەر کەسێک زۆر

قسەیکرد واتە زیرەکە بەڵام ئەوانەی بێدەنگن واتە نەفامن و گێلن هیچ نازانن.» یەکێک لە قوتابیەکان وتی: «مامۆستا وەکوو کامۆ ئەویش نەفام و گێلە هەر وەکوو مەڕ سەری شۆر دەکاتەوە و تەواو.» هەموو پێکەنین! منیش تورە بووم ڕۆیشتمە دەرەوە. مامۆستاکەم بە دوامدا هات و وتی: «کامۆ بوەستە! بۆ توڕەبووی؟ گەر حەز دەکەی بەیانی پێکەوە دەچینە شوێنێک. بۆ نایەی لەگەڵم؟» منیش پێم سەیربوو لە ژیانم یەکەم جارە کەسێک بمبا بۆ شوێنێک جا ئەویش مامۆستا بێت! بۆیە منیش سەرم لەقاند و واتە ڕازیم. بۆیە بۆ ڕۆژی دواتر لە دەرەوە چاوەڕێی مامۆستاکەم دەکرد. ئەویش منی بردە کتێبخانەکەی خۆی لە ماڵەوە. وتی: «کامۆ دانیشە ئێستاش قاویەکت بۆ دەهێنم باشە.» منیش سەرم سوڕمابوو لەم هەموو کتێبە. بەڕاستی ئەم کتێبخانەیە سەرسوڕهێنەربوو. دوای ئەوە مامۆستاکەم قاوەکەی داناو و وتی: «کامۆ ژیان بێ کتێب وەکوو ڕۆحێکە لە جەستەیەکی مردوو. بۆیە هەمیشە مرۆڤ دەبێت بخوێنیتەوە، چونکە خوێندنەوە چرایە بۆ شەوێکی تار، باشە کامۆ تۆ بڵێ خویندنەوە چیە لای تۆ؟» منیش سەرم سوڕما وتم: «باشە ئێستا چی بڵێم گەر نەزانم. ئەوە دەڵێ چەند نەفامە!» بۆیە بیدەنگ بووم. بەڵام شتێکی سەیر روویدا مامۆستاکەم وتی: «کامۆ تۆ ترس لە قسەکردنت هەیە واتە ناتوانی قسە بکەی وادەزانی گەر وشەیەک بڵێی هەموو گاڵتەت پێدەکەن و دەڵێن نەفام. بەڵام

تۆ وانیت بۆیە دەبێت خۆت بدۆزیەوە. تۆ وادەزانی زیرەکی واتە نمرەی بەرز یان بڕوانامەی بەرز تۆ واتێگەشتووی بەس هەڵەیە. کەسی زیرەک زۆرن. بۆ نموونە کەسێک گەر لە جەنگ سەرکەوێت ئەوە زیرەکە. کەسێک بزانێ بیر کاتەوە، زیرەکە... کەسێک نەخوێنێ بەڵام داهینان بکات ئەوە زیرەکە. کەسێک دایک و باوکی یان خێزانەکەی بپارێزێت ئەوەش واتە زیرەکە. کەواتە زیرەکی پێوەری بیرە نەک تەنیا بخولێتەوە لە پارچە کاغەزێک. تێدەگەی کامۆ؟ باشە من و تۆ لەمەودوا یاریەک دەکەین من هەموو ڕۆژێک پارچەیەک لەمە دەدەم بەتۆ کە ئەم پارچانە بریتین لەوشتەی کە دەتوانی پارچەکان لێکبدەی. شتێک دەردەچێت منیش هەر ڕۆژیک دانەیەک لەو پارچەیە دەدەم بە تۆ بزانم تۆش دەتوانی ئەم پارچانە لێکبدەی و بزانی چی دەردەچێت بەڵام تا ئەوکاتەی من پێت دەڵێم تۆ پارچەکان لێک مەدە، باشە؟» منیش ڕازیبووم. بەڵام سەیر ئەوەبوو، بە تێپەڕبوونی کات من زۆر گۆرا بووم چ لە دەرسەکان چ لە ماڵەوە. لە ژیانم بۆ یەکەم جار لە ناو پۆل من توانیم وەڵامی پرسیارێک بدەمەوە. کە بۆ یەکەم جاریش ئەو کەسەی کە چەپڵەی بۆلێدام مامۆستاکەم بوو. بۆیە بەخێرای دەچوومەوە بۆ لای مامۆستاکەم و فرمێسک لە چاوم دەهاتە خوارەوە باوەشم پێدادەکرد و وتم: «مامۆستا خۆشم دەوێیت! خۆشم دەوێیت! تۆ بێ هاوتای تۆ مامۆستای منی. من خۆشم دەوێیت» ئەو وەکوو

چۆن باوکێک ئامێز بۆ ڕۆڵەکەی دەکاتەوە. ئاوا لە ئامێزی کردم و منی گوشی و وتی: «کامۆ تۆ زۆر زیرەکی! تۆ بێ وێنەی!» ڕۆژێک بە دڵخۆشی دەچووم بۆ قوتابخانە بەڵام مامۆستاکەم لەوێ نەبوو بۆیە منیش وتم: «کوا مامۆستا هیوا؟» وتیان: «ئەو نەخۆشە لەماڵەوە کەوتووە نایەتە قوتابخانە!» کاتێک ئەوەمزانی وەکوو شێتم لێهات. بۆیە زۆر بەخێرای چوومە ماڵی مامۆستاکەم بەڵام خۆزگە هەر نەچوومایە قاچەکانم شەلەل بوایە بەڵام مامۆستاکەم وانەدیبایە! ئەو لەسەرجێگە کەوتبوو. چاوەکانی کە زۆر نووقمی خوێندنەوە بوو، ئێستا داخرابوو... دڵە بەسۆزەکەی زۆر بە هێواشی لێدەدات مامۆستاکەم تووشی شێرپەنجە ببوو بەڵام من نەمزانی بوو! بۆ منی باس نەکردبوو... ئەو ڕۆژە چاوەکانی کردەوە و وتی: «کامۆ وەرە پێشەوە... دەمەوێت شتێکت پێبڵێم... کامۆ تۆ قوتابییەکی بێ وێنەی! ئەزانی بۆ؟ چونکە بێدەنگی... وە زۆر دڵێکی بەسۆزت هەیە. بۆیە هەمیشە تۆم خۆشویستووە. کامۆ ئێستا کاتی ئەوەیە ئەو پارچانەی کە پێمدای لێکیبدەیت. بزانم چی دەردەچێت. بەڵێنم پێبدە کامۆ تۆ خۆت بدۆزیتەوە بەدوای خەونەکانتدا بڕۆی. لەوکاتەدا چاوەکانی داخست و بۆ هەتاهەتایە چاوەکانی نەکردەوە. منیش دوای چەند ڕۆژێک چوومە ژوورەکەم. دەستمدایە هەر یەک لە پارچەکان. خەریکی بووم دوای ماندووبوونێکی زۆر. ئەزانی چی دەرچوو کە باوەڕم نەدەکرد. ئەویش پارچەکان وینەی خۆم دەرچوو. واتە

ئەم پارچانەم لێکدا من دەرچووم بەڕاستی تەواو شۆک بووم. واتە زانیم ئەمە مانای ئەویە... مرۆڤ خودی رەنگدانەوەی خۆیەتی ئەگەر خۆتت دۆزیەوە کەواتە دەشتوانی سەرکەویت. بۆیە ئێستا من لە کتێبخانەی مامۆستاکەم چەندەها قوتابی فێردەکەم."

لەوکاتەدا من لە کۆتایی چیرۆکەکە چاوەکانم پڕبوو لە فرمێسک. لەوکاتە دایکم هاتە ژوورەوە و وتی: «وریا تۆ کتێبەکەی باوکت کۆتایی نەهات؟» منیش وتم: «تەواو بوو دایکە... تەواوبوو...» دوای ئەوەش کتێبەکەم بردەوە شوێنی خۆی و لەگەڵ دایکم چوومە دەرەوە...

## قسە نەووتراوەکانی دڵم

لە ناو ئەم هەموو جەنگ و شەڕە، سەربازێک بووم... لە گۆرەپانی جەنگدا. هەمیشە مردنی خۆم بۆ هەر چرکەیەک دەبینی هەمیشە دەمگووت: «ئێستا دڵم لە لێدان دەکەوێت و چاوەکانم جارێکی تر ئەم ئاسمانە نابینێتەوە» خولەک بۆ خولەک چەندین لاشەی هاوڕێکانم لە لای خۆم دەکەوتن و دیمەنێکی وەها ترسناکی درووست دەکرد کە ئاواتت دەخواست هەرچی زووترە، زەنگی وازهێنان لە شەڕ بدرێت. تا چیتر هیچ لە هاوڕێکانم نەبنە قوربانی گۆڕەپانی جەنگ. ئەم ئاسمانە وەکوو شەوێکی تاریکی لێهاتبوو، نەدەنگی باڵندە وە بینینی هەورەکان لە ئاسمان بەدی نەدەکرا. تەنیا گوێت لەدەنگی تۆپ و گوللە و ئازاری برینداری سەربازەکان دەبوو. لەلایەک هاواری فەرماندەکەم کەی دەیگووت: «بجەنگن ئێوە پارێزەری وڵاتن با بمرن ئێوە باکتان نەبێ، خوێنی

ئێوە دەبێتە هێمای  قوربانیدان بۆ نیشتمان .لە داهاتوو خێزانەکانتان و منداڵەکانتان شانازی بە ئێوەوە دەکەن! دەی بجەنگن!» ئەمە هەمیشە  لە گوێم دەزرینگایەوە هەموو ڕۆژیک، دوای هێوربوونەوەی شەڕ ئێمە لاشەی هاوڕێکەنمان هەڵدەگرت و دەماننناشت وە منیش شەوان دەچوومە ناو خێمەکەم دادەنیشتم. ئەو قسانەی کە لە دڵمدابوون دەمنووسیەوە، تا ڕۆژگار بوو ئەگەر مردم ئەم نووسینەی من کەسێک یاخود خێزانەکەم بیخوێننەوە. ئەو قسانەی کە لە دڵم بوون بەجێ نەمێنێ و لەدوای مردنم وەکوو لاشەکەم نەخرێتە ناوگۆڕ. بۆیە دەستم بە نووسینی دەکرد و لەوکاتەی کە هاتم بۆ ناو جیهانی جەنگ و شەڕ. هەمیشە دوای ئەوەی کە دەمزانی ئەمڕۆش لە مردن ڕزگاربووم دووبارە دڵم هەر لە لێدان نەکەوت و دەستەکانم لەشەڕ لەدەستنەدا. بۆیە یەکسەر دەستم بە نووسین دەکرد... ئەو شەوە دوای ڕۆژێکی پڕ لە شووم و سەخت کە شەڕێکی پڕ لەقوربانی و لە دەستدانی چەندین سەرباز. دووبارە دەستم بە نووسین کرد بەڵام ئەو شەوە ئەم باسەم زۆر جیاوازتربوو لە نووسینەکانی تر چونکە ئەو شەو باسی ئەو قسانە دەکەم کە ویستم  بڵێم  بەو کەسەی کە لە دڵمدابوو بەڵام نەگووترا باسی عاشق بوونی خۆم بە کەسێک دەکەم کە ویستم پێی بڵێم بەڵام نەگووترا، باسی "یاسەمین" یاسەمین ئەو کچە بوو کە خوازیاری دڵی من بوو. کە لە یەکەم نیگاوە عاشقی بووم

عەشقێک کە هەر لە یەکەم چرکەوە تا کۆتایی بە نەگووتراوی مایەوە. من ئەو کاتە پێش سەربازیم لە دوکانێک شاگردبووم، لە دوکانی مام سەعید ڕۆژانە کارم دەکرد و دەمتوانی بژێوی خێزانەکەم دابین بکەم سوپاس بۆ خوا هەر چۆنێک بوو ژیانمان باش بوو گەر وەکوو کەسانی تر نەماندەتوانی لە خۆشترین خانوو بژین یان باشترین خواردن بخۆین بەڵام هەر چۆنێک بوو ئێمە شوکرانەبووین بەوەی کە خودا چەندی بۆ دانابین هەر ئەوەیە. لە بیرمە دایکم هەمیشە دەیگووت: «ئەگەر ڕۆژێک لە برسییەتی سەرتان نایەوە و خەوتن، هەرگیز نەکەن سەرشۆڕکەن بۆ کەس. ئەگەر ڕۆژێک بزانن ئاوتان نییە بۆ خواردنەوە، هەرگیز ناشکور نەبن» ئەوە هەمیشە وەکوو بانگی هەموو بڵندگۆی مزگەوتەکان بوو کە هەمیشە دەووتراوە. ئەو ڕۆژە من دەچووم بۆ کار لەماڵ هاتمەدەرەوە بەڵام بینیم کە ئەو خانووەی بەرامبەرمان ماڵی تازەی دێتە ناوێ بۆیە خەریکی دابەزاندنی شتەکانی ماڵیان بوون منیش چوومە پێش و وەکوو کارێکی مرۆڤایەتی سڵاوێکم لێکردوون و وتم: «ئەگەر یارمەتیتان دەوێت من لە خزمەتدام.» خاوەن ماڵەکە کە لەگەڵ کورەکەی بوو و وتی: نەخێر برام سوپاست دەکەین. کارەکانمان زۆری نەماوە، لەوکاتەدا پیاوەکە وتی: «یاسەمین کچم وەرە ئەم شتانە ببە بیرت چوو.» یاسەمین ئەو کچە جوان و شۆخ شەنگە کە جوانییەکی بێ هاوتای هەبوو کە هەر لە هاتنە دەرەوەی بە دەنگ و

جوانیکەی منی سەرسام کرد و وتی: «بەڵێ باوکە بە چاوان!» ئای چ دەنگێکی هەبوو چ جوانییەکی هەبوو، جوانی یاسەمین هەر لەیەکەم نیگاوە وایکرد عاشقی بم. دوای تێڕوانینێکی زۆر لە یاسەمین و بیرکردنەوەیکی قوڵ ئەوانم بەجێهێشت چوومەوە سەرکارەکەی خۆم بەڵام لەم ڕێگا هەر خەیاڵم پەلکێشی دەکردم بۆ لای ئەو و چاوەکانی قژە خاوەکەی دەنگە پڕ لە سۆزەکەی منی بەتەواوی مەست کردبوو چەند ڕۆژێک تێپەر بوو ڕۆژێک لە دوکان بووم خەریکی کاربووم، لەناکاو کەسێک بە دەنگێکی شەپۆلی کەناری وتی: «سڵاو بە یارمەتیت!» ئای ئەمە چی بوو ئەمە چ دەنگێک بوو سەرم بەرزکردەوە چی ببینم یاسەمین وا لە بەردەممە سڵاوم لێدەکات! زۆر شڵەژاوبووم زمانم وشەیەکی دەهێنا و وشەیەکی دەبرد هەر چۆنێک بوو وەڵامم دایەوە و وتم: «سڵاو لە تۆش.» ئای خوایە چ چاوێکی هەبوو لە دوکانەکە مایەوە ئەو شتانەی دەیویست بردی. دوای ئەوە ڕۆیشت ویستم ڕایگرم بڵێم تکایە بمێنەوە هەموو دوکانەکە ببە بەس چرکەییەک زیاتر بمێنێتەوە. ڕۆژ بە ڕۆژ عەشقی یاسەمین لە ناخم زیاتر دەبوو. کاتێک دەهاتە دوکان کاتێک کە دەمدیت دەچووە دەرەوە. هەموو شتێکی جوان بوو بە تەواوی عاشقی یاسەمین ببووم. هەرچی زووتر دەمویست پێی بڵێم ئەوەی لەناخمە بۆی هەڵڕێژم جا ڕازی بێت یان ڕەتم بکاتەوە. هەموو ڕۆژێک دەمویست پێی بڵێم کاتێک دێتە دوکان یاخود لە ڕێگا بچمە بەردەمی و ئەو

نامانەی کە بۆم نووسیوە پێیبدەم کە بۆ ماوەی مانگێک نامەم دەنووسی بۆی. بەڵام نەمدەتوانی پێی بدەم ترسم هەبوو هەمیشە شتێک لە دڵم ڕێگردەبوو لەبەردەم درکاندنی ئەو قسانەی لە دڵمە. دوای مانگێک شتەکان گۆڕان وەک بڵێی ژیان ویستی ئەم نامانە نەدەم بە یاسەمین نازانم جا ژیان بوو یاخود ترسی من بوو بەڵام یاسەمین بۆ ماوەیەک زۆر نەدەهاتە دووکان یاخود بڵێم یاسەمین وەکوو ونبوویەکی لێهات. نە لە گەڕەگ و نە لە دوکان دیاربوو وە بێجگە لەوە نەک یاسەمین، بەڵکو ماڵەوەشیان کەسی لێ نەبوو هەندێک جار دەیانگووت: «ئەم ماڵە ڕۆیشتوون ئەگەرنا بۆوا بێدەنگن.» من بەتەواوی بەرەو بێهیوای چووبووم ئای خوایە ئەو شتەی کە دەمویست بڵێم بەو کەسەی خۆشم دەویست کەچی ئێستاش ئەو ونبووە. باشە یاسەمین بۆ کوێ ڕۆیشت بۆ دیار نییە، هەموو ڕۆژێک کە دەهاتمە دەروە چاوێکم هەر لەسەر ماڵی ئەوان بوو. لە دوکانیش تا درەنگ نەدەچوومەوە دەمگووت دەی ئێستا یاسەمین دووبارە بەدەنگە پڕ لە شەپۆلەکەی دەڵێ سڵاو بەڵام نا هیچ شتێک نەبوو ئەو ڕۆژە لە دوکان دەگەڕامەوە بەڕێگادا دەڕۆیشتم سەیارەیەک بە هێواشی بەلامدا تێپەڕبوو کە سەیرم کرد چی ببینم خوایە لەلایەک دڵخۆش بووم و لەلایەک خەمبار. دڵخۆشیەکەم ئەوەبوو ئەو کەسەی کە چەند دەمێک بوو چاوەڕێی بووم یاسەمین لەناو سەیارەکە بوو بەڵام خەمباریەکەم ئەوەبوو. یاسەمین یاسەمینێکی

تربوو چونکە ڕووخسارە شۆخ و شەنگەکەی جاران نەبوو بەڵکو ڕووخسارێکی مات و زەرد وە دڵتەنگی داچۆڕی کردبوو وەکوو کەسێک بوو. کە لە لێواری مردن بێت. وە کچێک کە هاوڕێی یاسەمین بوو  هەمیشە  پێکەوەبوون بۆ هەر شوێنێک چووبا لەگەڵ ئەوبوو یاسەمینی لە ئامێز گرتبوو، ئەم دیمەنە بۆ چەند چرکەیەک بوو بەڵام لە دڵم چیما تا ئەبد، گەڕامەوە ماڵەوە دانیشتم بێ هیچ سڵاوێک  دایکم وتی: «کوڕم چی بووە بۆ وای خۆ هیچ نەبووە بۆ وا ڕەنگت پەڕیووە.» وتم: «دایکە هیچ نییە من باشم تەنیا کەمێک ماندووم ئێستا بحەسێمەوە باش دەبم تۆ خەمت نەبێت.» بەڵام دایکم نەیدەزانی کورەکەی چی لێهاتووە چۆن کەوتۆتە دەست یاری قەدر،  نەمدەزانی چی بکەم. نازانم ئەو ڕۆژەم چۆن تێپەڕاند هەر مێشکم لای یاسەمین بوو، چاوێکم لە ماڵی ئەوان بوو... چوومە بەر دەرگای ماڵەوەیان ئاخۆ یاسەمین نابینم وە هەر چۆنێک بێت ئەمڕۆ قسەی لەگەڵ بکەم پێی بڵێم بزانم بۆ وایە ئەو شتانەی ناو دڵی خۆمی پێ بڵێم بەڵام لەوکاتە دەرگای ماڵی یاسەمین کرایەوە ئەو کچە هاتەدەرەوە کە هاوڕێی یاسەمین بوو ، بەڵام سەیر ئەوە بوو ئەو بە چاوێکی پڕ لە گریان و خەمێکی زۆر لەدڵ چووە ناو سەیارەکەیەوە، منیش دڵنیابووم شتێک بووە! بۆچی یاسەمین وابوو؟ بۆ ئەو کچەش دەگری؟ دڵنیام یاسەمین شتێکی لێهاتووە باشە بۆ ئەو ماوەیە دیارنەبوو ئێستاش کە هاتۆتەوە وابوو. بەدەم بیرکردنەوە لەو

شتانەبووم تاوەکوو بڕیارمدا بچمە بۆ لای هاوڕێکەی هەموو شتێک بزانم شوکر بۆ خوا لەبەر ئەوەی کۆڵانەکەی گەڕەکی ئێمە بچووک بوو. ئەمەش وای کرد زۆر دوور نەکەوێتەوە  بتوانم پێی بگەم. بچمە بەردەم سەیارەکە  بە هەناسە بڕکێوە خۆم گەیاندە ئەو ئەویش هاواری کرد وتی:

- تۆ شێتی  ئەوە بۆ یەکسەر دێیتە بەردەم سەیارەکە چیە لەخۆت بێزاری؟
- ببوورە خاتوون تکایە من شێت نیم بەخوا وە ژیانی خۆشم لێ قەرز نییە بەس ئەوەیە من وێڵم بەدوای وەڵامێک  کە ماوێکە زۆر سەرگەردانی کردووم. تکایە یارمەتیم بدە ئەمەوێت قسەت لەگەڵ بکەم سەبارەت بە یاسەمین.
- یاسەمین!

دوای ئەو سەرسوڕمانە!  چووینە شوێنێک دانیشتین وتی:

- باشە تۆ کێی؟  وە چۆن  یاسەمین دەناسی وە پەیوەندەی تۆ بە یاسەمین چیە؟

بێ هیچ وشەیەک هەرچی ئەو نامانەی کە نوسیبووم لەو ماوەی کە یاسەمینم دیوە تا ئێستا هەموویم نیشاندا ئەویش یەک بەیەک نامەکانی  دەخوێندەوە  تووشی شۆک بوو وتی:

- تۆ عاشقی یاسەمین بووی بەس باشە بۆ ئەمانە لای تۆیە بۆ نەتداوەتە یاسەمین؟ باشە ئەگەر شتێکی ئاواش بێت یاسەمین باسی دەکرد ئەو هیچ لەمن ناشارێتەوە.
- وایە ئەوە ڕاستە یاسەمین ئاگادارنییە کەمن عاشقی ئەوم وە هەرنامەیەکم نوسیووە ویستوومە پێی بدەم بەڵام نازانم ترسم هەبوو؛ یاخود قەدر وای کردووە پێی نەدەم. من ئێستا تۆم بۆ ئەوانە نەهێناوەتە ئێرە بۆ ئەم قسانە، بەڵکو تۆم هێناوە بۆ ئەوەی پێم بڵێی یاسەمین بۆ ماویەک وون بوو کەچی دوای دیارکەوتۆتەوە. وابوو؟ تکایە پێم بڵێ!

ئەویش چاوەکانی پڕفرمیسک بوو بۆ ماویەک تەنیا دەگریا دواتر بێدەنگ بوو، دوای ئەوە فرمێسکەکانی سڕی و کەوتە قسە وتی:

- من ئەو شتانە بۆ ئەوە بە تۆ دەڵێم لەبەرئەوەی دەزانم چەند عاشقی یاسەمین بووی وە ئەو هەموو ماوەیە چاوەڕێی یاسەمین بووی بەڵام با شتێک بڵێم تکایە ئەم نامانە هەروا چۆن هەڵتگرتوون لای خۆت وا بیهێڵەوە چونکە یاسەمین تووشی نەخۆشی شێرپەنجە بووە دکتۆرەکان تەنیا دوو مانگیان بۆ داناوە واتە ئەوکاتەی کە یاسەمین هاتووە بۆ ئێرە تا ئێستا بەدەست ئەم نەخۆشیە. دەناڵێنێت بەڵام ئێستا بەتەواوی یاسەمینی خستووە بۆیە تکایە نامەوێت یاسەمین ببەسترێتەوە بە عەشق و کۆمەڵێک هیوا. تکایە، داوات لێدەکەم ئەگەر

یاسەمینت خۆش دەوێت هەرگیز ئەم قسانە مەدرکێنە بیانخە ناو گۆڕەوە. تکایە بەڵێنم پێبدە نامەوێت ئەو پەیوەست بێت بەتۆوە.

دوای ئەوەش ڕۆیشت بێ هیچ وشەیەک منیش لەوکاتە دوای ئەو قسانە بڕیارمدا ئەو خۆشەویستە بخەمە ناو دڵم بینێژم بۆ هەتا هەتایە. دوای مردنی یاسەمین من دەمتوانی زۆر بە ئاسانی لە ئامێزی بگرم. وە ئەو نامانەی کە نووسی بووم بۆی بخوێنمەوە بەڵام بۆ خۆی نا بۆ گۆڕەکەی. ئێستا من لە جەنگیش هەردەم، ئاواتەخوازم بگەڕێمەوە تاوەکوو بتوانم دووبارە گۆرەکەی لە ئامیز گرمەوە. بێ ئەوەی بزانی کە کەسێک هەیە لەو دونیایە خۆشیویستووە...

## بێ ماڵئاوایی

هەمیشە وتراوە، دایک و باوک پیرۆزترین مرۆڤن لە سەر ڕووی زەوی. ئەوان خۆیان دەکەنە قوربانی لە پێناو ئێمە تا تەنیا دڵخۆش بین. جا هەریەکەیان بە جۆرێک؛ لە دەربڕینی خۆشەویستی باوک بە شەو و ڕۆژ کاردەکات بۆ پەیداکردنی نان بە ماندووبوونی زۆر و شەکەتەوە. وە دایکیش بەدڵێکی پڕ لە هەست و سۆزەوە خواردن ئامادە دەکات و جل دەشوات و بەخێوت دەکات بێ ئەوەی ڕۆژێک لێت بێزاربێت. ئەگەر شەوێک نەخۆش بیت ئەوە هەرچی ئازارە بۆ دایکەکە دەچێت تا بەیانی دادەنیشێ بۆ ئەوەی نەکا شتێکت لێ بێت. وە ئەگەر هەست بکەن سەرماتە ئەوە هەردووکیان دەبنە پۆشاک بۆ ئەوەی تۆ گەرم بیتەوە. ئەمەیە مانای ڕاستەقینەی دایک و باوک لە ژیان. ئەو

چیرۆکەی ئێستا باس لە کوڕێک دەکات. کە چۆن لە پێناو ئارەزووەکانی خۆی بێ ئاگا دەبێت لە دایک و باوکی و دوایش کۆتایەکی زۆر ناخۆش چاوەڕێی کرد.

"منم هەڵمەت ئەوە منم تا ئێستاش لەتاو دوا ماڵئاوایی باوکم دەناڵێنم. وە فرمسێک دەڕێژم ئاخۆ دەبێت خودا لێم خۆشبێت. چیرۆکی من لەوکاتەوە دەست پێدەکات کە ژنم هێنا لەسەرەتادا هەستم بەوە نەدەکرد کە هاوسەرەکەم لەگەڵ دایک و باوکم خراپە چونکە من ڕۆژانە دەچووم بۆ کار و تا ئێوارە نەدەگەڕامەوە ماڵەوە وە کاتێکیش دەگەڕامەوە هەر سڵاوێکم لە دایک و باوکم دەکرد و تەواو یەکسەر دەچوومە ژوورەکەمەوە و دەخەوتم تا بەیانی. لە کاتی نان خواردنیش هاوسەرەکەم دەیگووت: «ئەوان سەر مێزەکە پیس دەکەن! من کاتێک سەیریان دەکەم نانم پێناخورێت.» بۆیە نانی بۆ دەبردنە ژوورەکەی خۆیان و بە تەنیا نانیان دەخوارد ، منیش وەکوو کەسێکی نەزان و بێ ئەقڵ، ئەو شتانەم درکپێدەکرد و لەبەر خۆشەویستم بۆ هاوسەرەکەم گوێم پێ نەدەدا! زۆرجار باوکم دەیگووت:

- "هەڵمەت" زۆر بیرمان کردووی... بڵێ ئەوە بۆ هەر کە دێیتەوە. یەکسەر دەچیتە سەرەوە نایەی سەرێک لە ئێمە بدەی پێکەوە قسە بکەین ئاخر دایکت گوناهە لە جێگا کەوتووە ئێمە وەکوو پێشتر ناتوانین لەسەر قاچ بین، بێینە لات کوڕەکەم!

- باوکە من کارم هەیە، ماندووم. لە بەیانی تا ئێوارە کاردەکەم. شەکەتم، تاقەتم نییە! وە دوای ئەوە هاوسەرەکەم خواردنتان بۆ ئامادە دەکات و جلتان بۆ دەشوات. نازانم ئێوە چیتان دەوێت.
- کوڕەکەم ئاخر تۆ تێناگەی ئێمە پێویستمان بە تۆیە زۆر تۆمان خۆش دەوێت. تۆ کوڕی ئێمەی دەبێت ئاگاداری من و دایکت بیت.
- باشە تەواو دوای بزانم چۆن دەبێت. گەر کاتێکم دۆزییەوە دێم دادەنیشم لەلاتان.

بەڵام هەمیشە وام دەگووت و گوێم پێ نەدەدان. هەر خەریکی ژیانی خۆم بووم. هەرگیز گرینگیم بە ئەوان نەدەدا بەس خەریکی ڕازیکردنی هاوسەرەکەم بووم. بێ ئاگابووم لە دایک و باوکم. ئێوارەیەک گەڕامەوە بۆ ماڵەوە، بینیم هاوسەرەکەم جلەکانی کۆکردۆتەوەو وا خەریکە دەڕوات، منیش پێم سەیربوو! وتم:

- ئەوە بۆ جلەکانت کۆ دەکەیتەوە چی بووە؟ بۆ دەگری ئەزیزم؟
- من بە ڕاستی ئیتر بەرگە ناگرم. ناتوانم بژیم لەگەڵ دایک و باوکت! من وامزانی شوو بە تۆ بکەم ژیانێکی شاهانەم دەبێت. ماڵێکی پڕ لە ئارامی و پێکەوە دەچینە دەرەوە. خۆشبەخت دەبین! بەس من نەمزانی ژیانی من بەس دەبێتە بەخێوکردنی دایک و باوکت. ئەوە بزانە تۆ دەبێت یان من یان ئەوان هەڵبژێری! ئەگەرنا جارێکی تر من نابینیتەوە.

منیش دەستم گرت و وتم:

- ئەوە تۆ چی دەڵێی؟ هێمنبە! ئەگەر ئەوان شتێکیان بە تۆ وتووە ئەوە دەچم پێیان دەڵێم بزانم بۆ وایان بە تۆ وتووە بەس بزانە من ناتوانم ئەوان بە جێ بێڵم ئەوان دایک و باوکی منن. بەڵام بزانە تا ئێستا ئەوان تەنانەت نەهاتوونەتە سەر مێزی نان خواردنەکەش بەس لە ژوورێک بە تەنیا دامانناون. وەک بڵێی لە زیندانن! هەرچی بکەن دەنگیشیان نایەت بۆچی بێزاری؟ ئاخر من لەبەر تۆ ئەو دایک و باوکەی چەند ساڵ منیان بەخێو کردووە ئێستا هەر ناچم بەلایان!
- من ئەوە نازانم! ئەگەرنا بیانبە بۆ خانەی بەساڵاچووان! لەوێ ئارامتریش دەبن ئێمەش بۆ خۆمان ئارام دەبین. هەڵمەت من تۆم خۆش دەوێت نامەوێت لەبەر ئەوان من و تۆ لێک جودابینەوە تکایە.

دوای ئەوە نازانم چۆن بەو قسانە فریووم خواردوو و وتم:

- باشە بە گوێت دەکەم، بەس تۆ مەڕۆ! من بەیانی دەیانبەم بۆ خانەی بەساڵاچووان.

بۆ بەیانی چوومە ژوورەکەی دایک و باوکم کە بۆ ماوەی چەند هەفتەیەک بوو. هەر بەلایاندا نەچووبووم بە بیانووی کار و شتەوە. کاتێک چوومە ژوورەوە دایک و باوکم منیان بینی زۆر دڵخۆش بوون باوکم وتی:

- ئای خوایه شوکر  ئەمڕۆ دیارە ئیشت نییە هاتووی بۆلای ئێمە .سەیرکە ئافرەت ئەوە کوڕەکەمان هاتووە بۆلای ئێمە.

هەستیان بە دڵخۆشییەکی زۆر دەکرد. دایکم بەدەستە لەرزۆکەکەی وتی:

- وەرە کوڕم دانیشە! دەمەوێت وەکوو جاران سەرت لەسەر چۆکم دانێی و منیش گۆرانیت بۆ بڵێم زۆر دەمێکە چاوەڕێی ئەو ڕۆژە دەکەم دووبارە دەست لە پرچە جوانەکەت بدەم. باشە هەڵمەت تۆ بۆوا لاواز بوویت؟ دەڵێی زۆر ماندووی؟ بۆ ئەوەندە خۆت ماندوو دەکەیت؟ پشوو بدە و نانی باش بخۆ! دەستەکانت بۆ ئەوەندە ساردە؟ تۆ هەمیشە کاتێک منداڵ بوویت کاتێک دەستەکانت سارد دەبوون خێرا دەهاتییەوە، دەتگووت دایکە سەرمامە دەستم سڕبووە. منیش دەستەکانتم لە ناو دەستەکانی خۆم دادەنا تا گەرم دەبوویەوە.

من نەمدەتوانی بەرگەی ئەو شتانە بگرم دەموویست پێیان بڵێم ئەوە ئەو کوڕە نییە کە بیری لێ دەکەنەوە! بۆیە وتم:

- پێتان چۆنە ئەمڕۆ دەوام نییە بتانبەم بۆ شوێنێک تاوەکوو ئێوەش کەمێک لەم ژوورە بێنەدەرەوە؟

هەردووکیان زەردەخەنەیەکیان کردوو و زۆر دڵخۆشبوون! بەڵام بێ ئاگا لەوەی جارێکی تر نایەنەوە بۆ ئێرە، بۆیە

هەردووکیانم ئامادەکردوو و جلەکانم بۆ کۆکردنەوە بەڵام باوکم تێبینی کرد و وتی:

- باشە کوڕم خۆ ئێمە بۆ کاتێکی زۆر لەوێ نابین بۆ جلەکانی ئێمە کۆدەکەیتەوە؟
- نا ئاخر ئەو شوێنە وای دەوێت بۆیە دەی بابڕۆین...

دوای ئەوە هەردووکیانم بردە خانەی بەساڵاچووان وتم:

- ئێوە بڕۆنە ژوورەوە منیش تا شوێنێک دەچم دوای دێمەوە دواتان باشە. سەیرکە، ئێرە شوێنێکی زۆر خۆشە خەڵکی لێیە بێزار نابنمنیش دوای کەمێکی تر دەگەڕێمەوە.

بەڵام لەوە زیاتر بەرگەم نەگرت نەمدەتوانی بینەری ئەو ساتەبم کە جێیان دەهێڵم. لەو کاتە باوکم بانگی کردم وتی:

- هەڵمەت زوو وەرەوە. بابچینەوەماڵەوە چاوەڕێت دەکەین.

بە چاوێکی پڕ لە سۆز و بەزەیی بە دەستێکی لەرزۆکەوە بە پشتێکی چەماوەوە چاوەڕێی منیان دەکرد. ئەوانم بەجێهێشت هەر نەگەڕامەوە بەدوایاندا. دەستم بە ژیانی خۆم کرد، وامزانی هەست بە دڵخۆشی دەکەم ئەگەر ئەوان لە ماڵ نەبن یان ژیانێکی باش دەژیم گەر ئەوان نەبن. بەڵام من ڕۆژ بە ڕۆژ ژیانم سەختر دەبوو. وەکووو پیاوێکی هەشتا ساڵی منیان دەبینی، بەردەوام هەستم بە شەرمەزاری دەکرد. بەخۆمم دەگووت: «من چیم کرد بۆ وامکرد چۆن ئەوانم بردە ئەو شوێنە لە پێناو خۆشبەختی خۆمان! ئاخر ئەوان دایک و باوکی من بوون. هەڵمەت لە بیرت

چوو  باوکت وتی "زوو وەرەوە چاوەڕێت دەکەین"؟» هەموو ڕۆژ من زیاتر و زیاتر بەرەو ڕووخان دەچووم. هەستم بەوەش نەدەکرد ئەمە کاری خودایە بۆ ئەو گوناهەی کە کردوومە  ژیانم بەتەواوی تێکچوو. وامدەزانی ئەگەر ئەوان نەبن لە ژیانمان خۆشبەخت دەبین. بەڵام وانەبوو ژیانی من بووە دۆزەخ. هاوسەرەکەم لێم جیابوویەوە، بەجێی هێشتم! من بەتەنیا مامەوە لە ماڵەوە. بەڵام هەستم دەکرد ئەمە بە هۆی ئەو کردەوانەمە کە کردم بەرامبەر دایک و باوکم.  ئێستاش دەبێت  باجی تاوانەکەم بدەمەوە. بەسەر   شۆڕی بگەڕێمەوە لە دەرگای خودا داوای لێخۆشبوون بکەم!  بەڵام کەسێکی وەکوو من تاوانبار چۆن و بە چ ڕوویەک داوا لەو خودایە بکەم، کە چەند بە ڕەحم و بە بەزەییە!  کە هەمیشە داوای کردووە لەگەڵ  دایک و باوکتان باشبن، ئاگاداریانبن،  بێ دڵیان نەکەن. دوای ئەو هەمووکاتە چوومەوە بۆ ئەو شوێنە بۆ ئەوەی بتوانم  ئەو کارانەی کە کردوومە پەشیمان ببمەوە. بەڵکو خودا لە گوناهەکانم خۆش بێت. چوومە خانەی بەساڵاچووان. بەڵام خۆزگە نەچووبام چونکە دوای چوونم بەتەواوی تێگەیشتم، من چەند کەسێکی خراپ بوومە! چۆن وامکردووە؟ ئەوە بوو باوکم وەفاتی کردبوو! پێش بمرێت، داوای کردبوو من ببینێ وتبووی: «من چاوەڕێی کوڕەکەم دەکەم ئەو دێتەوە،  دەمەویت ماڵئاوایی لێبکەم.» بەڵام نەیتوانی چونکە باوکم وەفاتی کردبوو و ماڵئاوایشی لێنەکردم.

دایکیشم لە سەر جێگا وەکوو مردوویەک. هەر کە منی بینی دوای ئەو هەمووکاتە وتی:

- کورِم کارەکەت تەواو بووە و هاتووی ئێمە ببەیتەوە؟ ئێرە شوێنێکی خۆش نییە، خەڵکی زۆری تێدایە. بەس ناگات بە پارچەیەک لە دڵی من. بەڵام درەنگ هاتی چونکە باوکت رِۆیشت. منیش هەر چاوەرِێت بووم، خۆزگە زووتر هاتبای تاوەکوو باوکتمان ببردبایەوە بۆماڵەوە.

## خودا نزیکه

دوای چەند ساڵ لە هاوسەرگیری سوپاس بۆ خودا، دوای پشکنین دەرکەوت کە دووگیانم. ئەمەش هەواڵێک بوو کە من و هاوسەرەکەمی زۆر دڵخۆش کرد. زۆر سوپاسی خودامان کرد کە دوای چەندین ساڵ بێبەشی نەکردین لە بوونی منداڵ لەو نیعمەتە جوانەی خودا کە دەیدا بە مرۆڤ. ئەوکاتە لای دکتۆرەکە دانیشتبووین کە وایگووت؛ لەگەڵ هاوسەرەکەم لە دڵ خۆشیان نەمانزانی چی بکەین. هاوسەرەکەم وتی: «خونچە نەمگووت خوا بە ڕەحمە هەرگیز بەندەکانی جێناهێڵێت!» دکتۆر وتی: «خونچە خان تۆ دەبێت زۆر ئاگاداری خۆت بیت ئاگات لە تەندرووستی خۆت و منداڵەکەشت بێت بۆ ئەوەی وەکوو ئەوانەی تر لە دەستی نەدەی ئەمجارە. ئەمجارە بەدڵی خۆت دەبێت. دەبیت بە خاوەن منداڵێکی جوان.» دوای خواحافیزی لە دکتۆر ڕۆیشتین بۆ ماڵەوە بەڵام لە خۆشیان نەمدەزانی چیم دەگووت و چی دەکەم بە تەواوی هەستەکانی دڵخۆشی زاڵ ببوو بەسەرمدا. بەس خودا

دەیزانی چ هەستێکم هەبوو کە دوای ئەو هەموو ساڵە دکتۆر پێم بڵێت دووگیانیت. بەس ئەو ئافرەتانە تێدەگەن کە منداڵیان نییە و بێبەشن لە منداڵ. بەردەوام شەو و ڕۆژ دوعام دەکرد بۆ ئەوەی دووبارە ئەم خۆشییەم لێ نەبێت بە هەورێکی ڕەش و بارانی خەم بەسەرم بباریێت. ئەمەش بووە هۆی بوونی ترسێکی زۆر لە ناخم. ترس لەوەی کە ئەم منداڵەش لە دەست بدەم ئەوەش زۆر بە ئاشکرا لە ڕووخسار و ڕەفتارم ڕەنگی دابویەوە. کە هاوسەرەکەم زۆر بە ڕوونی هەستی بەم ترسەی من کردبوو بۆیە وتی: «هەرگیز بیری خراپ مەکە مێشکت. ئەمە لە شەیتانەوە دێت. تۆ دەبێت لەگەڵ خودا بیت لە هەر بارودۆخێکدا. گەر خودا بڕیاری دابێت ئەم منداڵە موڵکی ئێمە بێت هەر هی ئێمەیە ئەگەر هاتوو پێچەوانەش ڕوویدا ئەوە دەبێت شوکرانە بین ئارام بگرین لەسەری.»

ئەم قسانەی هاوسەرەکەم ئارامییەکی زۆری بە دڵ و دەروونم دەدا. لە ژیانی خێزانداری هەمیشە بوونی پیاوێکی باش و دیندار نیعمەتیکی پڕاو پڕ لە جوانییە. جوانترین و باشترین هاوسەر ئەو پیاوەیە کە لە کاتی ناخۆشی لەگەڵ خێزانەکەی دایە و بەجێی ناهێڵێ. بەڵام ئەفسووس لەگەڵ ئەو هەموو ڕەفتار و گوفتارە جوانەی هاوسەرەکەم، کە باسی سەبر و ئارامی بۆ دەکردم بەڵام ترسەکەم زیاتر و زیاتر قوڵتر دەبوویەوە ئەمەش وایکرد لەم بارودۆخەمدا دڵخۆشییەکەم زۆر نەبا و بکەوینە بەر هەورێکی

ڕەشی ناخۆشی ژیان. لەو شتەی کە زۆر دەترسام بەسەرم هات ئەوەبوو شەوێک تووشی ئازارێکی زۆربووم کە هاوارم دەگەیشتە ئاسمان. بۆیە زۆر بەپەلە هاوسەرەکەم منی بردە نەخۆشخانە. دوای چەندین پشکنین و شت دکتۆرەکە زۆر بە خەمباری هات بۆلام و وتی: «هیوادارم باشبیت سوپاس بۆ خوا ئێستا تەندروستیت باش بووە.» منیش بێ ئەوەی لە تەندرووستی خۆم دڵنیابم یەکسەر وتم: «ئەی منداڵەکەم، چۆنە ئەو باشە!؟» دکتۆر وتی: «ببوورە خونچە خان، دووبارە دیارە خودا ویستی لەسەر نییە تۆ ببی بە خاوەن منداڵ، بەداخەوە!» لەو کاتە بێ ئەوەی هیچ وشەیەک بڵێم یەکسەر کەوتمە باری بێدەنگی و سەرچەفی نەخۆشخانەکەم بەسەر ڕووخسارمدا دا. بەڵام تاکە شت بەخەبەر بوو، فرمێسکی چاوەکانم بوون کە ئەوان بە ئاگابوون ژیانم لە هەواڵێکی دڵخۆشکەرەوە گۆڕا بۆ ناخۆشی و گریان و بێدەنگی. تەنانەت لە ماڵەوەش ئەو بارودۆخەی جارانی ژیانمان نەما بوو. ئەوەش بەهۆی منەوە بوو چونکە بەردەوام دەگریام سکاڵام دەکرد دەمگووت خودایە ئاخر بۆچی چ گوناهێکم کردووە؟ من دوای ئەم هەموو چاوەڕوانییە لە تۆ! تکا بۆ بوونی منداڵێک، کە پێم بڵێ دایکە! ئەمە شتێکی زۆر ئاسانە بۆ تۆ خودایە! ئەمە چ هەورێکی ڕەش بوو بەسەرم هات؟ بەڵام دووبارە هاوسەرەکەم کەوتە باری گفتوگۆ دووبارە بەقسەکانی منی بەرەو دونیای ئومێد و ئارامبوونەوە برد کاتێک هاتە گفتوگۆ

و وتی: «ئەی هاوسەرەکەم نەتزانیوە و نەتبیستووە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت (هەر کەسێ هەوڵی ئەوە بدات کە ئارام بگرێت خودای گەورە پێی دەبەخێشت. وە هیچ کەس لە نیعمەتی ئارام گرتن باشتری پێنەبەخشراوە.) وە بزانە هەر گووتراوە (هەرگیز لە ئارام گرتن بێزار مەبن. خودا ویستی لەسەر بێت بە چاوتروکانێک ئاواتەکەت ئەهێنێتە دی.) هەموو ئەمانە کە گووتراوە واتە پێویستە مرۆڤ لە کاتی هەژاری یان ناخۆشی یان نەبوونی منداڵ ئارام بگرێت. دڵنیابە خودا ئارامگرانی خۆش دەوێت.» ئەم قسانە دووبارە منی بەرەوە کانیاوی خۆشەویستی خودا و لەزەتی دونیا و ئارامی برد. ئەوە بوو دوای چاوەڕوانییەکی زۆر خودا بێبەشی نەکردم بە بوونی منداڵ منیش لە وشەی دایک بێبەش نەبووم. خودا کچێکی جوانی پێ بەخشیم کە هەر چاوم بە منداڵەکەم کەوت هەموو ئەو خەمەی کە خواردبووم. هەموو ئەو فرمێسکانەی کە ڕشتبووم نەگەیشت بەو کاتەی کە یەکجار بۆنی منداڵەکەم کرد. نەگەیشت بەو لەزەت و خۆشیەی کە لە باوەشم کرد. وە ناوم نا (دوعا) چونکە من بەهۆی دوعاکەنمانەوە گەیشتم بە دوعای خۆم، کچەکەم.

## له قەفەزی قوفل کراودا

ڕۆژێک له ناو قەفەزێکی قوفل کراودا دوو باڵنده به ناوی باڵندەی ئومێد و باڵندەی بێ ئومێد کەوتنه گفتوگۆ دەربارەی حاڵ و گوزەرانی ژیانیان ئاخۆ چۆن دەڕواننه ژیانیان لەم قەفەزه قوفل کراوەدا.

باڵندەی ئومێد وتی: بەڕاستی ژیان لەناو قەفەزەکانیش زۆر جوان و چێژبەخشه ئەگەر له ئاوێنەی پڕ له ئومێدی تێی بڕوانین.

باڵندەی نائومێدی وتی: نەخێر ئەسڵەن ئازادی خۆشترین هەسته که مرۆڤ تێدایه کاتێک به ئازادی بەم ئاسمانه پاک و جوانه هەڵدەفری و لەهەموو کەس بەرزتر دەبیت لەم سنوره بۆ ئەم سنوره. نەک نوقمی کۆت و زنجیری ئەم قەفەزه بیت.

باڵندەی ئومێد هاتە وەڵام و وتی: ئەم سنور و ئاست بەرزیەی تۆ لەوانەی تر  چ سودێکی هەیە گەر تۆ ناخت کۆت و زنجیر بێت وە بزانە گەر لە قەفەزیش بووی هەر نیشتیمانت بەنرخ تر و خاوەنەکەت بە سۆزترە، کوا لە دەرەوەی ئەم قەفەزە کێ ئاگای لە تۆیە هەرکەسە و بۆ خۆی دەژی کەس تێناگە لە سۆز و هەستت. هەر کەسێک دووربێت لە نیشتیمانی خۆی ئەوە بۆ ئەبەد ئاوارە و غەمگینە.

ئەم گفتوگۆیە هەر بەردەوام بوو ئەم جارەش دووبارە باڵندەی بێ ئومێد هاتە قسە وتی: ئەم نیشتیمانەی تۆ باسی دەکەی کوا نان کوا ئاو ڕۆژێک هەر دەمرین لە برسان تۆ بە چی وا شوکرانی؟  شوکرانی چی بکەم، ئەگەر وەکوو باڵندەکانی تر شوێنی خۆش و ئاوی زۆر و خواردنی زۆر نەبێت؟ هەر ئەوان باشترن لە ئێمە.

باڵندەی ئومێد وتی: شوکرانە بژی نیعمەتێکی ئیلاهییە جا لەسەر خواردن بێت یان ماڵی دونیا ئەوە بزانە هەمیشە ئەوەی ئەهلی شوکرانە بژێربێت چاکەکارە لەلای خودا. وە قسەیەکی تریش ئەوە بزانە ئەگەر خواردنت نەبوو هەرگیز نامری لەبرسان چونکە خودا خۆی ڕزقدەرە وە ئەگەر زمانت شکا لە تێنوێتیان لە بیابانا ووشک و  بێ ئاوی کە هیچ گوڵێک بوونی نەبێت ئەوە ئەگەر خودا فەرمان دەربێت کانیاوی سازگارهەڵدەقوڵێ.

لە کۆتایی ئەم گفتوگۆیە باڵندەی نائومێد وتی: من بێزاربووم لەم قسانە تۆ ئەگەر بەم شێوەیە بیت؛ بەم  ئاقڵەوە بژیت تا هەتایە هەر لەم قەفەزە داخراوەدا دەبیت بۆیە من دەمەوێت ئازادبم وە ڕاکەم لەم قەفەز و ژیانە وەکوو باڵندەکانی تر بڕۆم لەو سنور بۆ ئەو سنور بە ئاسمانەوە بەرزتربم لە ئەوانەی ترەوە.

باڵندەی ئومێد وتی: ئەگەر دەڕۆی بڕۆ بەس بزانە ڕۆژێک هەر دەگەڕێیتەوە بۆ ئەم نیشتیمانە.

دوای کۆتایی هاتنی قسەکان باڵندەی نائومێد بە هەر جۆرێک بوو ڕووی لە هاوڕێی چەندین ساڵی وەرگێڕاو ڕۆیشت لەم قەفەزە چووە دەرەوە.  وە باڵندەی ئومێد بە هەستێکی پڕ لە خەمباریەوە لەناو دڵی وتی: ڕۆژێک دێت هەر دێیتەوە بۆ لام هاوڕێکەم چونکە ئەگەر تۆ ئازادی خۆت لە ماڵ و خواردنی باش دەبینیتەوە ئەوە بزانە تۆ هەمیشە کۆت و زنجیری ئەگەر لە حەوت دەرگای ئاسمانیشەوە بڕوانییە خوارەوە. بە تێپەربوونی ژیان و چەندین وەرز و ساڵ باڵندەی نائومێد بە برینداری و شەکەتی و  خەمەوە گەڕایەوە. بەڵام بێ سوود بوو چونکە کاتێک گەڕایەوە هەموو شتێک گۆڕابوو هەم لە قەفەزەکەوە هەم لە شوێنی ماڵەکەی لەجیاتی هاوڕێی چەندین ساڵەی باڵندەیەکی تر هەبوو وە بۆیە زانی زۆر درەنگ کەوتووە بۆ گەڕانەوە بۆ ڕۆژانی رابردووی چونکە ئێستا نە هاوڕێیەک نە شوێنێک نە ماڵێک نە خاوەنێک

نەمابوو. بۆیە لەسەر دیوارەکە نووسی: هەرگیز  لە پێناو ماڵی دونیا و ئازادی لە ڕادەبەدەر و ئاست و لوت بەرزی خۆتەوە، نیشتیمان و هاوڕێکەت جێ مەهێڵە چونکە کاتێک دەگەڕێیتەوە ئەو برینەی دوێنێ دروستت کرد هەرگیز ساڕێژ نابێتەوە وە ئەو کەسانەی پێشتر هەرگیز دووبارە دروست نابنەوە.

# بوختان

لە ماوەی ئەو چەند ساڵەی ژیانی هاوسەریم بەردەوام ئاواتم بوو، ڕۆژێک گوفتارێکی خۆش لە لەلایەن خەسووم و هاوسەرەکەم بگووترێت. سەرەڕای هەموو ئەو ئازار و مەینەتییە کە بەردەوام بە دەستی هاوسەرەکەم دەمچەست چ بە لێدان یاخود قسەی نەشیاو بەرامبەرم. بەڵام من تاکە خەونێک کە هەمبوو بە بەردەوامی ئەوە بوو، بەیانییەک هەستم لە خەو ئەو ڕۆژە جیاوازبێت لەو ڕۆژانەی تر کاتێک سەیری ئاسمان بکەم ببینم دووبارە لە ئاسمانی ڕووی من هەورە بروسکە و هەوری ڕەش نەبێت. بەڵکو من وەکوو باڵندەیەک بە ئاسمانێکی هێمن و بێ تۆفان و هەورە بروسکە بفرم! بەڵام ئەفسووس ئەوە تەنیا خەونی ئافرەتێکی پڕ ئازاربوو لە چوارچێوەی ماڵێک. لە هەمووی ناخۆشتر بۆ من بێجگە لە قسە ناخۆشەکانی دایکی هاوسەرەکەم کە هەموو ڕۆژێک ببووە بەرنامە بۆ من و دەمنۆشی. بەڵام خاڵی لاوازی پیاوەکەم کە هەرکاتێک دەهاتەوە بۆ ماڵەوە خەسووم هەر قسەیەکی لەگەڵ کردبا ئەوە دەهات بێئەوەی هیچ

ڕوونکردنەوەیەک لەمن وەربگرێت یەکسەر دەکەوتە بەرگیانم بە لێدان و ئازاردانی جەستەم بێجگە لە ئازاری جەستەم من ئازاری ڕۆحیشم هەبوو. کە قسە ناشیاوەکانی بوو کە دەبوونە برینێک لەناو دڵم. جا من هەمیشە پێموایە برینی جەستە هیچ کاتێک ناگاتە برینی دڵ چونکە لەوانەیە، ئەو برینەی جەستەم بۆ ماوەیەکی تر چاک بێتەوە! بەڵام ئەی چیبکەین بۆ برینی دڵ کە هەرگیز چاک نابێتەوە؟ هەرگیز و هەرگیز! بۆ ئەبەد شوێنەواری دەمێنتێەوە لە دڵمان! ئەو کاتانەی کە هاوسەرەکەم بە گوێی دایکی دەکرد و دەهاتە بەرگیانم، ئەوە خوێن وەکوو جۆگەیەک  لە لووت و دەمم دەهاتە دەرەوە. فرمێسکی چاوەکانم وەکوو ئاوێکی سوێر بوو دەڕژا بەسەر برینەکانم کە هەمیشە ئەو برینانە وەکوو پەڵەیەک بوو لەسەر ڕووخسارم! کاتێک دەچوومە بەردەم ئاوێنە سەیرێکی خۆم دەکرد خۆم وەکوو پیرێژنێکی ناشرین دەهاتە بەرچاو خۆم لە ئاوێنەکە دووردەخستەوە بۆ ئەوەی خۆم لە خۆم نەترسێم بەهۆی ئەو برینانەی لە ڕووخسارم دابوو! سەرەڕای ئەو هەموو ئازارەش هەر بەردەوام کۆڵم نەدەدا لەو ماڵە دەمامەوە دەمگووت: «بەڵکو ڕۆژگاربێت خوا ڕەحمێک بخاتە دڵی ئەوانیش و باشبن.» خۆ مرۆڤ تا هەتایە ناتوانێ ژیانی بە قسەی نادروست و بوختان بباتە سەر. ئەو باوەڕەی من هەمبوو بە خودا، خودا هێزی پێدەبەخشیم و توانای پێ دەدام لە بەردەم ئەم ئازارانە هەر وەکوو دەڵێن لەگەڵ تێپەربوونی ڕۆژگار زۆر شت

دەبێت بە خوو واتە دەتوانی لەگەڵی ڕابێیت جا ئەو ڕاهاتنە دوو شێوازە یان ئەوەتە ڕاهاتنی ناچارییە کە بە ناچاری دەبێت لەگەڵ باروودۆخەکە ڕابێیت کە ناچارییە؛ بۆ ئەوەی کەسێک لە دەست نەدەی کە خۆشت دەوێت یان ئەوەتە لە پێناو ئابڕوو و شەڕەفی خۆتە. شێوازی دووەم ئەوەیە ئەم ڕاهاتنە بە شێوەیەک بۆ ئەوەیە دەزانی ناتوانی ئەم شێوازە بگۆڕیت و ئەمەش دەبێتە خوو. بۆیە لەگەڵ تێپەربوونی کات هەموو شتێک دەبێتە ڕاهاتنی خوو یان ناچاری. بۆیە منیش دەتوانم بڵێم ژیانم ڕاهاتنێکی ناچاری بوو لەگەڵ ئەم بارودۆخە کە تێدابووم. بەڵام لەگەڵ هەموو ئەو ئازارانەی پیشوتر، خۆزگە هەرگیز ئازاری ئەمجارە ئەوەندە قوڵتر نەبوایە و سەختر نەبوایە بۆ منی ئافرەتێکی بریندار! ڕۆژێک هەر وەکوو ڕۆژانی تر خەریکی کاری ماڵەوە بووم خەسووم بانگی کردم گووتی:

- پەری کچم، وەرە کارم پێتە.

منیش چوومە لای گووتم:

- بەڵێ دایکە گیان فەرموو.
- وەرە دانیشە کەمێک ئیشم پێتە. بەسە ئەوەندە خۆت ماندوو مەکە لە ئیشی ماڵ! با پێکەوە بۆ خۆمان قسە بکەین، وەکوو کچ و دایکێک.

باوەڕ دەکەن ڕێک شۆک بووم خوایە ئەوە چیدەڵێت. ئەو لە ژیاندا ئەسڵەن بەمنی نەگووتوە کچم! وە لە ژیاندا بۆ جارێک من

و خەسووم پێکەوە دانەنیشتوین! ئاخر چیبووە؟ هەندێ جار هەستم دەکرد ئەمە خەونە دەمەوێت بە خەبەر بێمەوە بەڵام کاتێک خەسووم بە قسە هات زانیم ئەوە خەون نییە، پەری بەخوا ڕاستییە! خەسووم دەیگووت:

- چیە؟ پەری بۆوا شۆک بووی؟ دەزانم حەقی خۆتە شۆک بیت، چونکە لە ژیانم هەرگیز بەم شێوەیە ڕەفتارم لەگەڵ تۆ نەکردووە، وەکوو بوکێکی خۆم تەنیا تۆم بە بێگانە زانیوە. وامزانیوە تۆ بە کەڵکی کورەکەم نایەیت. بەس دەمەوێت ئەوانە لەبیرکەین هەردووکمان پێکەوە وەکوو کچ و دایک بژین. کوڕەکەشم ئەگەر لە سەفەر هاتەوە قسەی لەگەڵ دەکەمەوە پێی دەڵێم تۆ بێتاوانی هەموو کاری من بوو من قسەی ناڕاستم بۆ تۆ دەکرد تا تۆش لە پەری بدەی. ئەمانەی هەموو پێدەڵێم بەس تۆ لێمخۆشدەبیت کچەکەم؟
- ئەوە چی دەڵێی دایکە توخوا من هەمیشە بە ئاواتی ئەوەبووم ئەم ڕۆژە ببینم و تۆ بە کچی خۆت بانگم بکەی! باوەڕ بکە کە ئەم قسەیەت کرد ئێستا وا دەزانم هەرچی ئازار و برینە کە پێشتر هەمبووە، نەماوە و سارێژبووە!

سەیرێکی یەکترمان کرد و ئامێزمان لە یەکتر نا. بەڵام منی خۆش باوەڕ و کەسێکی دڵ سادە باوەڕم نەکرد کە ئەوە یارییەکی دەستی چارەنووسە بۆ من. ڕۆژێک خەسووم گووتی:

- پەری من دەچمە دەرەوە تۆش ئاگاداری ماڵەوە بە. من کەمێک زۆرم پێدەچێت، ئیشم هەیە.
- باشە دایە خەمت نەبێت.

دوای ئەوە منیش دەستم بە ئیشی ماڵ کرد. پاش چەند کاتژمێرێک لە دەرگا درا. منیش گووتم لەوانەیە دایکم بێت شتێکی بیرچووبێت بۆیە چووم دەرگاکەم کردەوە بینیم پیاوێکی باڵا بەرز و قژێکی ماشوبرنجی هەبوو گووتی:

- سڵاو خاتوون ئێرە ماڵی فڵانە؟
- بەڵێ تەواوە ڕاست هاتووی. فەرموو چیت دەوێت؟
- هاوسەرەکەت هاوڕێی منە لەم سەفەرەش پێکەوە بووین جا من گەڕامەوە. ئەویش گووتی ئەم ئامانەتە بگەیەنە دەستی هاوسەرەکەم وابزانم چەند دیاریەکە بۆ تۆی هێناوە.
- بۆ من؟

وا هەستم کرد لەوانەیە بە  هەڵە هاتبێی ئاخر هاوسەرەکەم لە ژیانی خۆی دیاری بۆ من نەهێناوە ئێستا چی بووە؟ بەڵام هەر چۆنێک بوو سوپاسی ئەو پیاوەم کرد و گووتم:

- بەڕاستی ئەزیەتت خوارد سوپاست دەکەم.
- نانا خاتوون ئەوە چی دەڵێیت من زۆر خۆشحاڵ بووم بە ناسینی تۆ.

دوای ئەوە هاتمەوە ژوورەوە دیاریەکەم کردەوە بینیم چەندین جل و بۆنی تێدایە. بەڕاستی بە لای من جێگەی سەرسوڕمان

بوو! تەنانەت کەوتمە باری گومانیشەوە بەڵام لەناو دڵی خۆم گووتم نا پەری نابێت کەسی بڕوادار گومانی خراپ بە کەسانی تر ببا گوناحێکی گەورەیە. بەس ئەگەر دایکم هاتەوە پێینیشان دەدەم با ئەویش ئاگادار بێت خودایە خۆت ئاگاداری حاڵی من بە من بەس تۆم هەیە ئەو شتانە چییە بەسەرم دێت! جارێک گۆڕانکاری خەسووم ئەمڕۆش هاوسەرەکەم ئەمە چییە دەگوزەرێت بۆ حاڵی من؟ دوای ئەوە پاکەتی دیاریەکەم پێچایەوە کە خەسووم هاتەوە پیشانمدا ئەویش گووتی:

- ئەها ئاگادارم لە تەلەفۆن کورەکەم باسی ئەو دیاریانەی بۆ کردم. گووتی بۆ پەری دەنێرم ئێ کچم دڵخۆش بە بەڕاستی تۆ شایەنی هەموو شتێکی.

بەڵام لەوە سەیرتر ئەوە بوو ئەو شتە هەموو ڕۆژێک دووبارە دەبویەوە وەکوو میلی کاتژمێر هەموو ڕۆژێک ئەم پیاوە دەهات و دەیگووت پیاوەکەت ئەم دیاریانەی بۆ تۆ هێناوە لەوەش خەسووم زەردەخەنەیەکی دەکرد سەری دەلەقاند بەمانای ئەوەی ئاگاداری ئەوەیە و دڵخۆشە پێی. بەڵام لەوە سەیرتر کە بەڕاستی تووشی شۆک بووم ئەو ڕۆژە بوو کە هاوسەرەکەم بە تورەیەکی زۆرەوە هاتەوە چاوەکانی وەکوو ئاگر بوو دەستەکانی وەکوو کەسێکی پیر دەلەرزی بێ ئەوەی هیچ قسەیەک بکە وەکوو جارانی پێشوو دەستی بە جوێندان و لێدان کرد. هەتا توانی کەوتە گیانم بە لێدان و قسەی نەشیاو هەر دەیگووت:

- تۆ کەسێکی بێشەرمی چۆن توانیت ئەو هەلە برەخسێنیت من بچمە سەفەر و تۆش بۆ خۆت لەگەڵ پیاوانی تر ڕابوێریت هەی ئافرەتی بێ ئابڕوو!

منیش کاتێک گوێم لەو قسانە بوو خەریک بوو شێتبم گووتم:

- بەسە ئەوە تۆ چی دەڵێی پیاوەکە من چیم کردووە سەیرکە من هەموو شتێک لە تۆ قبوڵ دەکەم بەس ناتوانی وا بە من بڵێی دوای ئەوەش تۆ بەبێ ئەوەی هیچ بەڵگەیەکت پێ بێت یاخود لێم بپرسی یەکسەر وەکوو ڕۆژانی ڕابردوو دێی بۆ گیانم ئاخر لە چ یاسایەکی قورئان و دونیاش وا بووە کەسێک بەبێ ئەوەی حاڵی بێت لە کەسی بەرامبەر، بکەویتە بەر لێدان و قسەی نەشیاو.

بەڵام پیاوەکەم بەو قسانەی من زیاتر بەرەو شێتی چوو چونکە بە تەواوی ئاگری تورەیی لـــە ناخی بڵێسەی کردبوو چەند وێنەیەکی خستە بەردەمم:

- فەرموو سەیرکە خاتوونی ڕۆشنبیر سەیرکە ئەوە کێیە لەگەڵ ئەو پیاوە لەبەر دەرگا  لەگەڵ یەکتر قسە دەکەن و ئەویش دیاریت پێ دەدا؟ جا ڕۆژێکیش نا بەڵکو چەندین ڕۆژ! چییە ئەوە هەلت بۆ ڕەخساوە من لە ماڵەوە نەبووم بە ئارەزووی خۆت ڕەفتارت کردووە، ها؟ دوای ئەوەش باسی قورئان و قسەی ناو کتێبم بۆ دەهێنیتەوە خاتوونی ڕۆشنبیر.

منیش سەیری وێنەکەم کرد بینیم هەمان ئەو پیاوە بوو کە چەندین ڕۆژ دەهاتە ماڵمان بەبیانووی ئەوەی دیاری کە بە قسەی ئەو هاوسەرەکەم بۆی هێناوم. منیش گووتم:

- پیاوەکە باوەڕبکە تۆ هەڵە تێگەیشتووی لەوانەیە لەوە درۆ نەکەم بە ڕاستی پێت بڵێم بەڵێ وا بوو هەموو ڕۆژێک دەهات بۆ ماڵمان بەڵام ئەو دەی فەرموو هاوڕێی تۆیە وە دەی فەرموو هاوسەرەکەت ئەم دیاریانەی بۆ تۆ هێناوە باوەڕبکە ئەگەر بە منیش باوەڕ ناکەی ها لە دایکت بپرسە بانگی دایکت بکە چونکە من ئەو دیاریانەم هەمووی پیشانی دایکت دەدا.

پیاوەکەم بانگی دایکی کرد و گووتی:

- دایکە وەرە کارم پێتە.

ئەویش هات و گووتی:

- بەڵێ کوڕم بۆ وا تووڕەی چی بووە؟
- دایە پێم بڵێ ئەو ڕۆژانەی من لە ماڵەوە نەبووم چی ڕوویدا؟ قەد بووە کەسێک بێت دیاری بۆ پەری هێنابێت و بە تۆیشی نیشان بدات. چونکە خاتوونی بەڕێز دەڵێ دایکی تۆ ئاگاداری هەموو شتێکە دەی پێم بڵێ تۆ ئاگاداری دایکە؟

بەڵام مخابن وەڵامی دایکی زۆر سەیرتربوو لەو تووڕەیەی هاوسەرەکەم و ئەو وێنەی کە هاوسەرەکەم نیشانیدام. گووتی:

- وەڵا کورەکەم ڕاستە هەموو ڕۆژێک کەسێک دەهاتە بەردەرگا و پەری دەچوو دەرگای دەکردەو دوای ئەوەش کە دەرگاکەی دادەخستەوە زۆر دڵخۆش بوو سەیری دیاریەکەی دەکردوو بەڵام هیچی نیشانی من نەدەدا دەی شاردەوە بەس پێت بڵێم کوڕم پەڕی لە دوای تۆ زۆر گۆڕابوو بە تەواوی ببووە کەسێکی تر.

منیش بەڕاستی شۆک بووم زانیم ئەوە بۆسەیەکبوو بۆ منی داماو داندرابوو بۆیە گووتم:

- دایکە ئەوە چی دەڵێی گوناهت دەگات باوەڕبکە ئاخر تۆ کەسێکی باوەڕدار و خواپەرستی، چۆن دەتوانی قسەی ناڕاست بکەی؟ تۆ خۆت ئاگاداری هەموو شتێک بووی! ئێستا بۆ وا دەڵێیت؟

بەڵام لەوکاتە هاوسەرەکەم زلەیەکی لێدام و منی بە زەویدادا کە دەمم پڕبوو لە خوێن سەیرێکی کردم گووتی:

- بە ڕاستی زۆر لەوە بێشەرمتری کە بیرم لێدەکردەوە! تۆ خۆت ئافرەتێکی بێئابڕووی ئێستاش دەتەوێت بوختان بۆ دایکی من بکەی؟ هەر ئێستا پێش ئەوەی دەستم بە خوێنت پیس بێت لەو ماڵە بڕۆ دەرەوە. جارێکی تریش هەرگیز نەتبینمەوە چونکە دایکم ڕاستی دەکرد تۆ بە کەڵکی من نایەیت من ناتوانم ئافرەتێکی بێشەرمی وەکوو تۆ ژیانی لەگەڵ بەسەربەرم. بڕۆ دەرەوە!

منیش هەستام بە بێ ئەوەی هیچ قسەیەک بکەم جلەکانم کۆکردەوە. بەڵام پێش ئەوەی بڕۆم سەیرێکی هەردووکیانم کرد و گووتم:

- ئێوە زۆر بە ئاسانی بوختانتان بۆ من دروستکرد. زۆر کەسیش وەکوو ئێوە هەیە لەم کۆمەڵگەیە، کە بوختان بۆ کەسانی تر دروست دەکات. بەڵام ئەوە بزانە ئەگەر لای ئێوە بوختان وا ئاسان بێت لای خودا زۆر گەورەترە. وە هەر ئەویش ئاگاداری کردەوەی هەموو مرۆڤێکە.

دوای ئەوەش چوومە دەرەوە و گەڕامەوە ماڵی باوکم. چی بکەم لەم کۆمەڵگەیە کاتێک ئافرەتێک بوختانی دەدرێتە پاڵی. جگە لە ماڵی باوکی شوێنێکی تری نییە جا ماڵی باوکیش دەیکوژن یاخود پێی دەڵێن تۆ حەیای ئێمەت بردووە و دەبێت لەو شوێنە بڕۆیت. تاوەکوو ئەم کارەی تۆ نەبێتە پەڵە بۆ هەموومان بەس بیرێک لەو ئافرەتە ناکەنەوە و جارێک ناچن لێی بپرسن ئاخۆ هەر بەڕاست مەسەلە چیە؟ بزانن ئەو برینەی لە دڵی دایە قوڵە یاخود تەنیا هەر بە جەستە زیندووە ئەگەرنا ڕۆحی نەماوە. ئەمانە هەمووی ئەو پرسیارانەیە کە منیش وەکوو هەر ئافرەتێکی تر دەمەوێت بزانم خۆ خێزانەکەی منیش دوور نەبوو لەو فکرانە کە هەیان بوو سەبارەت بە من. چونکە بەداخەوە باوەڕیان کرد و ملیان شۆڕکرد بۆ دەستی قەدر و بوختانێکی وەها گەورە. بەڵام من چونکە باوەڕم بە خودا هەبوو کە ڕۆژێک هەموو شتێک ئاشکرا

دەبێت. ئەوە هەمیشە بە قەناعەتی زۆرەوە ژیانم دەکرد دڵنیابووم ڕۆژێک خودا ڕاستی و داوێن پاکی من دەردەخا. خۆشەبەختی ئەوەیە کەسێک باوەڕی تەواوی بە خودا هەبێت چونکە وەکوو من ڕۆژێک هەموو شتێکی بۆ ئاشکرا دەبێت.

سوپاس بۆ خودا هەموو شتێک ئاشکرابوو وەکوو بارانێکی پاک و جوان دڵۆپەکان ڕژان بەسەر هەموو کەسێک و تەنانەت خێزانەکەشم کە من ئافرەتێکی داوێن پاک و خاوێنم. سوپاس بۆ خودا دەڵێن پەتی قسەی ناڕاست هەمیشە کورتە ئەوەبوو دایکی هاوسەرەکەم خۆی دانی بە هەموو شتێک نابوو کە ئەو بووە هۆی ئەوەی ئەم بوختانە بە من بکات و هەر خۆی ئەو پیاوەی گرتبوو تا ئەم کردارە بەرامبەر من بکات هەموو ڕۆژێک بێتەماڵمان بەبیانووی دیاری. خودایە هەر تۆی خاوەنی زەوی و ئاسمان بە ڕاستی تۆ حەق و ڕاستی بۆیە هەمیشە هەر ڕاستت خۆش دەوێت و بوختان و قسەی ناڕاست قبوڵ ناکەیت.

## جیهانی دەرەوە

سەردەمێک لە ماڵێکی بچووک و خێزانێکی بە ناز و خۆشەویستی دەژیام. کە ئەم ماڵە لە چوارچێوەی خۆشیەکانی مندا نەبو. وام دەزانی لە قەفەزێک کۆت و بەندکراوم. سەرەڕای ئەم هەموو ناز و خۆشەویستیە و ئازادیەی پێم دەدرا کە هەر چیم ویستبا بۆم دەکرا. ئەمەش لەبەر ئەوەی کچە بچووکەکەی ماڵەوە بووم. کەواتە خۆشەویستیەکی تایبەتم هەبوو نەدەبا هیچ کەسێک بۆ جارێکیش بێت قسەیەکی هەڵە بەرامبەرم بکات. جا لە دەرەوە یاخود ماڵەوە. ئەمەش بۆ من دەرفەتێکی باش بوو بۆ ئەوەی ئەم شتانە هەڵقۆزمەوە و بەرەو جیهانی غروری و کۆمەڵگەی دەرەوە هەنگاو بنێم. بۆیە هەرچی زووتر دەمویست ئەم ماڵە بکەمە گۆشەیەکی بچوک لە ژیانی خۆم و ژیانی دەرەوە بکەمە جیهانی خۆم. ئەمەش کاتێک گەیشتمە تەمەنێک کە بمەوێت  بچمە ناو

کۆمەڵگەی ئازادییەوە. وە کاتێک ڕووم کردە ئەم جیهانە ئەو کاتە هەستم کرد زۆر دواکەوتووم تەماشای ئەو کچ و کوڕانەم دەکرد کە ئازاد بوون و بە ئارەزووی خۆیان بێ گوێدانە لە کەسانی دەوربەر ژیان دەکەن. وە هیچ کەسێک نییە لێیان بپرسێتەوە بەخۆم دەگووت: ئای تۆ چەند دواکەوتووی تازە بە تازە هاتووی بۆ ئەم جیهانە پڕ لە ئازادیە کە ئێستا تەکنەلۆجیا ڕێڕەوی مرۆڤی گرتۆتە دەستی خۆی وای کردووە مێشکی مرۆڤ لەژێر ناوی ئازادی و خۆشیەوە کۆنترۆڵ بکە. من پێشتر سەرەڕای هەموو ئەو ئازادیەش لە ماڵەوە هەم بوو بەڵام هێشتا عەوداڵی ئەم جیهانە بووم کە بتوانم بە ئارەزووی خۆم جلوبەرگ بپۆشم و تا درەنگانی شەو لە دەرەوەبم لەگەڵ هاوڕێکانم وە هاوڕێیەتی دروست بکەم لە هەردوو ڕەگەز کە ئەم نەریتە بشکێنم کە دەڵێن نابێت کچ و کوڕ هاوڕێیەتی بکەن و لەگەڵ یەکتر بچنە دەرەوە وام دەزانی ئەمە نەریتێکی کۆنە و دەبێت بشکێنرێ. بە تێپەربوونی کات لەگەڵ ئەم کۆمەڵگەیە ڕاهاتم توانیم هاوڕێ دروست بکەم و تێکەڵ ببم بە تەکنەلۆجیا بە شێوەیەکی خراپ بەکاری بهێنم ژیان بە ڕۆتینی بەم شێوەیە بەردەوام بوو بە چوونە دەرەوەم و لەگەڵ هاوڕێکانم  تا درەنگانی شەو کە هیچ کەسێک لە ماڵەوە پێیان نەدەگووتم بۆ کوێ دەچیت؟ لە کوێ بوویت؟ وە کاتێکیش وایان گووتبا باوکم دەیگووت: ئەوە کچی خۆمە و ئازادم کردووە وە بەناز و خۆشەویستە نابێت هیچ کەس

ڕێگری بکات با بە ئارەزووی خۆی بکات بچێتە دەرەوە ئەویش گەنجە و مافی هەیە خۆشی ببینێت. ئەم قسانەی باوکم زیاتر ڕێگا خۆشکەر بوو بۆ ئەوەی هەرچیم بوێت بیکەم بەڵام ئەم جیهانە خۆشەی کە من بیرم دەکردەوە وا نەبوو بەڵکو وەکوو مارێک بوو خۆی حەشاردابوو لێم. کە هەر سانییەیەک بوو جەستەی منی گەستوو ژەهرەکەی بڵاوکردەوە لە جەستم وە پەڵەیەکی لەسەر جەستەم بەجێهێشت. ئەم ژەهرەش منی نەکوشت بەڵام پەڵەیەکی دروست کرد کە هەموو ڕۆژێک ئاواتی مردن دەخوازم.

لە ژیانم بەردەوام بووم  هاوڕێی خراپ منی زیاتر بەرەو جیهانی زبڵ و بۆگەن برد کە وایکرد هەرچی خودا نەفرەتی لێکردووە ئەنجامی بدەم  وەکوو ئەمانە:

خودا  دەفەرمووێت: (بالاپۆش بن جەستەی خۆتان دەرمەخەن با نەکەونە بەر ئاگری قورسی دۆزەخ) بەڵام من ئەمەم نەدەکرد بەڵکو وام دەزانی ئەگەر جلی تەسک و ڕووت نەپۆشم کەس سەیرم ناکات کوڕەکان فەرامۆشم دەکەن و نرخم بۆ دانانێن.

وە خودا پێمان دەفەرمووێت: (خۆتان بپارێزن لە خواردن و خواردنەوی حەرام) بەڵام من کەوتمە جیهانی ئاڵودەبووی ماددەی هۆشبەر و خواردنەوەی حەرام کراو، ئەوەش کاتێک هاوڕێکانم پێیان دەگووتم بۆ وا ترسنۆکی تۆش وەکوو ئێمە بە

خۆشی وەرگرە تۆ گەنجی  منیش بەو ساویلکەییەی خۆم تووش دەبووم و ملەکەچی قسەکانی ئەوان دەبووم بەڵام لە هەمووی خراپتر کە تووشی بووم لە ناوبردنی ژیانی کچایەتیم بوو بۆ ئەو گورگانەی کە بە ناوی عەشق و هاوسەرگیرییەوە فریوت دەدەن و دوای ئەوەی کە  بەدەستی دەهێنن . پێشت دەڵێن تۆ ئەو کچە نیت کە ئێمە دەمانەوێت تەنیا بۆ ڕابواردن لەگەڵت بووین تۆش کاتێک بە هۆش خۆت دێیتەوە دەزانی تازە کار لە کار ترازاوە ئەو کچەی جاران نەماوی بەڵکو کەسێکی پیس و بۆگەن لە ناو کۆمەڵگە کە نە لەلای خێزانەکەت نە لەلای خزم و دۆستان و کۆمەڵگە شوێنت نابێتەوە! لەم کاتەش خێزانەکەت پەشیمانی خۆیان دەردەبڕن دەڵێن ئێمە هەڵەبووین ئازادی زۆرمان پێدای نەدەبا وا بکەین ئەمەش ئاکامەکانی ئازادی و خۆشەویستی زۆر.

## گفتوگۆکان

باوکم: «کوڕی شیرینم خودای گەورە مرۆڤی بە جوانترین شێوە دروست کردووە لە خۆڵ بە چەندین شێوە و کەسایەتی جیاواز و هەریەک لەوانیش بە پێی نێر و مێ دابەشی کردوون وە تەواوکەری بۆ هەریەک لەو ڕەگەزانە داناوە بۆ ئەوەی ژیان لەگەڵ یەکتر دروست بکەن و وەچە بخەنەوە. جگە لەو هەموو ناز و نیعمەتەش کە خودا لە زەوی بە مرۆڤی بەخشیوە و لە دونیا  ئاخیریش بەهەشتی بێکۆتایی داناوە بەڵام لەگەڵ ئەوانەش ئێمەی مرۆڤ ئەو شتانە درک پێ ناکەین هەوڵی خراپ بوونی یەکتر دەدەین  لە بری شوکر کردن لەسەر ئەو شتانەی هەمانە و نیمانە هەوڵ بۆ سکاڵا و گازندەکردن دەدەین لەلای خودا بێ ئەوەی بزانین دونیا خۆشیەکی کاتیە ئەم هەموو تاوان و گوناهە بۆ چییە، لەکاتێکدا قیامەت بوونی هەیە. کە دونیایەکی تر بێ کۆتاییە کە هەرگیز کۆتایی نایەت کەواتە کوڕم هەمیشە هەوڵی

چاک بدە و مەبە ناشرین کردنی کەسانی تر بەڵکو هەمیشە جوان دید و گوفتار شرین بە.»

لەم قسانەی باوکم گەیشتم بەوەی کە نابێت ناشکوربین کاتێ ناخۆشی دێتە ڕێگامان و لە هەژاری و نەخۆشی لەبەر ئەوەی خودا دەیەوێت مرۆڤ تاقی بکاتەوە لە کاتی هەژاری و نەخۆشی وە دەبێت شوکربین کاتێک خودا شتێکی باشمان پێ دەدا نەک لە خۆبایی بین و ئەم خۆشییە ببێتە هۆی تاوان و سەرپێچی کردنی خودا.

***

دایکم: «کوڕەکەم ئاگاداربە کاتێک ویستت لێکدانەوە و ڕوون کردنەوە بۆ قسەکان یان کردارەکانت بکەیت. دەبێت بزانی ئەو کەسەی لە بەرامبەرتە کێیە و چۆنە! چونکە هەندێ کەس هەمیشە خۆیان پێ ڕاستە و هەرگیز دان بەقسەی ئەوانی تر دانانێن کە ئەمەش جۆرێک دەبێت لە خۆپەرستی و عینادی لە ئاست قسەکانی دەوروبەر بۆیە ئەگەر دەتەوێت دووربیت لە ئاژاوەو توڕەبوون هەوڵبدە هەمیشە بێدەنگی هەڵبژێری لە ئاست ئەو کەسانە لەبەر ئەوەی زیاتر تۆش هەوڵی عینادی بدەی ئەوە هەمیشە دۆڕاو دەبیت .»

لەو قسانەی دایکم ئەمەم بۆ ڕوون بویەوە کە هەرگیز  هەوڵ مەدە قەناعەت بە کەسێک بکەیت کە دەزانی کەلەڕەقە هەمیشە خۆی پێ ڕاستە گەر بزانێت تۆش حەقی بۆیە دوور بە لەو کەسانە. کە زانیت گفتوگۆکەت زۆری خایاند ئەوە کاتی خۆت مەکوژە و ئەو شوێنە جێبهێڵە بۆ ئەوەی دوور بیت لە شەڕ و هەڵچوون.

❊❊❊

خوشکم: «براکەم، دەڵێن گەر بەردێک لە پەنجەرەی ماڵێک بگریت ئەوە ڕۆژێک لە بەنچەرەت دەگرنەوە. لەو قسەیە کە زۆر ڕوون و ئاشکرایە هەرگیز بە کچانی خەڵک ڕامەبوێرە بە بیانووی خۆشەویستی و هاوسەرگیرییەوە دوای ئەوەی کە هەواو نەفسی خۆت تێرکرد دوای ئەوە فڕێی بدەیە سەر شەقام و کۆڵان ئەوە بزانە کەسی باوەڕدار کە دڵی بە تەواوی لە ئیمان  نقووم بێت ئەوە چاو و هەموو ئەندامەکانی دەپارێزێت لە تاوان و کاری خراپ  بۆیە هەرگیز نەکەی ڕۆژێک کارێک بکەیت لەبەر ئەوە بیربکەوە تۆش خوشکت هەیە لە ماڵەوە لەوانەیە ڕۆژێک ئەم بەردە بەر پەنجەرەی ئێمە بکەوێت.»

لەم قسانەی خوشکم بۆم ڕوون بویەوە زۆرێک گەنج هەیە لە ڕێگەی فەیسبوک و چاتەوە بە کچان ڕادەبوێرن بە بیانووی هاوسەرگیرییەوە کەچی لە کۆتایش هیچ شتێک بوونی نابێت بەس

بۆ کات کوشتن، ئەمانە بوونی دەبێت. وە کاتێکیش دەزانن خوشکەکەی ئەوانیش لە پەیوەندی دایە ئەوە توڕە دەبن و وە زۆرجار دەبێتە کوشتنی کچەکە بە بیانوی شەڕەف و حەیا.

***

براکەم: «دووربە لە شتانێک کە دەزانی بەرەو گومڕایی دەتبەن و دەتخەنە کەناری گوناح و تاوان  وە هاوڕێیەتی کەسانێک مەکە کە هەوڵی خراپ بوونی تۆ دەدەن تووشی خواردنێکت دەکەن کە دروست نییە و وە خواردنەوەیەک کە خودا حەرامی کردووە و دوورت دەخاتەوە لە نوێژ و عیبادەتی خودا.»

لێرەدا بۆم ڕوون بویەوە، هەوڵ مەدە هاوڕێی زۆرت هەبێت ئەمە مانای ئاقڵی نییە بەڵکو هەمیشە هاوڕێی کەم بەس باش بن لەکاتی ناخۆشی و خۆشی لەگەڵت بن. بتوانن لە کاتی ناخۆشی تووشی ناشکور و تاوانت نەکەن و لەکاتی خۆشیش وات لێ بکات تووشی گومڕای و لە خۆبایت نەکەن ئەمەیە هاوڕێی باش.

# پێڕست

